مەلا عەبدوڵڵای زێوەر



# گەنجینەی مەردان
# و
# یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری

محەمەدی مەلا کەریم

هێناویەتە سەر شێوە نووسینی ئێستا و
پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە

مەحموود زەنگەنە بە چاپی گەیاندووە

بە یارمەتیی ئەمینداریی گشتیی ڕۆشنبیری لاوان لە چاپ دراوە

مەلا عەبدوڵڵای زێوەر

# گەنجینەی مەردان

# و

# یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری

محمدی مەلا کریم

هێناونیەتە سەر شێوە نووسینی نوێ‌و
پێشەکی‌و پەراوێزی بۆ نووسیون

مەحموود زێوەر بە چاپی گەیاندوون


بە یارمەتیی ئەمیندارێتیی گشتیی ڕۆشنبیری‌و لاوان لەچاپ‌دراون

چاپخانەی (شركة مطبعة الاديب البغدادية)
بەغدا — ١٩٨٥

# پێشەکی

محمدی مەلا کریم

ئەم کتێبی (گەنجینەی مەردان)ی زێوەرە ئەبوو دە دوانزە ساڵ لەمەوبەر لەچاپبدرێ . لە سەرەتای ساڵانی حەفتاوە لای من دانراوە بەنیازی ئەوەی بە شێوە نووسینی نوێی کوردی بینووسمەوەو ئامادەی لەچاپدانی بکەم . بەڵام تا دوامانگەکانی ساڵی ١٩٨٢ نە من لایەکم بەلایا کردەوەو ، نە خاوەنەکانیشی بەسەریانکردەوە .

پایزی ئەو ساڵە ، ڕۆژێکیان کاك مەحموود زێوەر بە کۆڵێ گلەیی یەوە هاتەلامو ، منیش بە کۆڵێ پێ لە درێغیی خۆ نانەوە چووم بەدەمیەوەو گفتمدایە لەوە زیاتری دوانەخەمو ئیتر خەریکی بمو ، وایشبوو . وردە وردە دەستم دایە . پاشان پاشبەندەکەشی بۆ هێنام کە پاشماوەی لە فەوتان ڕزگاربووی یادداشتێکی هەندێ لەو ڕۆژانەی زێوەرە کە پاش تێکشکانی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموودی نەمرو بریندارکرانو بەدیلگیرانی ، سەردەمێکی ژیانی لە مەریوانو سەقزو بانەو موکریان بەسەربردووە .

لەبارەی گەنجینەکەوە ، رەنگە زۆرکەس بڵێن ئێمە چمان بە مێژووی پیاوەتیی کەسانی وەك ئیسماعیلی سامانیو ئۆکتای قائانی مەغوولو نیزامولمولکی سەلجووقیو سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانیو کەسانیواوەیە ؟ بەڵکو بێ گومان کەسانیوا هەن تەنانەت لە باسی هەندێ لەو کوردانەش رازی نین کە باسیان لەم گەنجینەدا کراوەو ئەڵێن بۆ ئەبێ شتیوا بڵاوبکرێتەوە . من خۆیشم لەوانەیە لە هەندێ رووەوە ، تارادەیەك لەگەڵ ئەم رایانەدا بمو ، لاموابێ تا هەندێ کەسی بە لێدوان پێویستتر لەئارادا بن ، هەق نەبێ بە باسی ئەو جۆرەکەسانەوە خەریك ببین ، نەخوازەلا کە زێوەر لە هەموو سەرێکەوە هەڵینەسەنگاندوونو ، بەڵکو ئەوەشی لێ داوا ناکرێ کە بە بەرچاوروونیەکی زانستییانەوە لە هەموو سەرێکەوە هەڵیانسەنگێنێ . بەلام مەسەلەکە بەمجۆرە لێكنادرێتەوە . چونکە یەکەم ، زێوەرە باسەکەی نووسیوە ، نەك ئێمەو ، پرسی بە کەسیشمان نەکردووە کە چیئەکاو چینا کاو ، بۆچوونی خۆی هەیەو خاوەنی بیروڕای خۆیەتیو ، هیچ مەرج نییە بە سەنگو ترازووی ئێمەو ئەمڕۆی ئێمە شت لێكبداتەوە .

دووهەم ، کەسێکی پایەی ئەدەبی بڵندی وەك زێوەر کە باسێکی نووسی ، ئەبێ بە بەشێك لە کەلەپووری نەتەوەو ، ئەگەر لە فەوتان نەپارێزرێ ، ئەوە واتا زیانێکی زلمان لە کەلەپووری هەژاری دەرەتان تەنگی نەتەوە داوە . لەبەرئەوە مافی ئەوەمان نییە ئەم بەرهەمەی زێوەر پشتگوێ بخەینو ، بە هەموو حاڵێ ئەبێ ئەگەر بۆ تاقە جارێکیش بووە بڵاوی بکەینەوە .

زیاد لەوەش ئەم نووسینەی زێوەر ، لەبارەی شێوەی نووسین‌و لەبارەی زمانیشەوە کەرەستەیەکی زۆر لەبارە بۆ هەڵسەنگاندنی نووسینی ئەو سەردەمەو دەست‌نیشان کردنی پێشکەوتن یا لەجێی خۆدا مانەوەی شێوەو زمانی نووسینی کوردی لەم چەند ساڵەدا تا ئەمڕۆ . هەروەها بۆ ناسینەوەی بیری کۆمەڵایەتیی کەسێکی وەك زێوەریش . ئەمە هەمووی سەرەڕای ئەوە کە زێوەر لە زۆر باسی ئەم کتێبەیدا شتی‌وای بۆ خستووینەتە سەر قاقەز کە کەسی‌تر نەینووسیوەتەوە ، یا ئەگەر نووسرابێتیشەوە هێشتا خەڵك پیێان نەزانیوەو نەکەوتووەتە پێش چاویان . سەد بریا لە هەر چەرخ‌و سەردەم‌و لە هەر ناوچەیەکدا چەندکەسی وەك زێوەرمان بووایە شتێکیان لەبارەی سەردەمی خۆیانەوە وەك ئەم (گەنجینەی مەردان)ە نووسیبوایە ، جا ئەوسا ئەمانزانی چ‌کەڵکێکمان لەو نووسینانەوە دەسگیر ئەبوو ! ئەگەر شتی‌وا بنووسرایە ، ئێستا گەلێ ڕووی کوێرەوەبووی مێژوومان بەڕۆشنی لە بەرچاومانا ئەژیا .

خۆ پاشبەندەکەی گەنجینەکە ، کە بەداخەوە لە سەرەتاوە دوو لاپەڕەی‌و لە ناوەڕاستەوە دوو لاپەڕەی‌ترو لەدواییشیەوە نازانم چەند لاپەڕەی لێ فەوتاوەو ، لەبەرئەوە نازانرێ زێوەر خۆی چیی ناوناوەو[1] بە چ مەبەستێك نووسیویە : ئاخۆ هەر ویستوویە یادگاری ئەو چەند ڕۆژی دەربەدەری‌یەی پاش تێکشکانی دام‌و دەزگای شێخ مەحموودو وەرگەڕانی تەخت‌و بەختی فەرمانڕەوایی‌یەکەی تۆمار بکا ، یا سەرجەمی بیرەوەری‌یەکانی خۆی لەمەڕ بزووتنەوەی شێخ بخاتە سەر کاغەز . . بەڵێ ،

---

(١) من خۆم ناوی (یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری)م بۆ ئەم یادداشتانەی زێوەر دانا .

ئەم پاشبەندە پڕە لە زانیاریی بەکەڵكو ، وادیارە یەکەمین بابەتێکی یادداشتی‌یە بەکوردی نووسرابێ .

لە نووسینەوەی ئەم گەنجینەو یادداشتەدا سەرنجی ئەوەم داوە هیچ جۆرە دەسکاری‌یەك نەکەم کە خوێندەوار پێی‌نەزانێ ، ئەوە نەبێ کە پێوەندی بە شێوە نووسینی نوێوە هەبێ . لەم بە شێوە نووسینی نوێ نووسینەدا ئەو (و)ی عەتفو (ی)ی ئیزافانەی زێوەر زۆر جار پشت‌گوێی خستوون ، من هەمووم نووسیون . هەر (و)ێکی نووسراویش ئەگەر ئەو خۆی بە (وە)ی نووسیبێ یا شوێنەکەی‌وا پێویست‌بکا (وە) بێ ، منیش وام‌نووسیوە . ئەوانی‌کەیانم هەر بە (و)ی ڕووت نووسیوە . دووریش نی‌یە ئەو خۆی لە هەندێکی تریشیانا (وە)ی مەبەست بووبێ ، بەلاّم من خۆم باوەڕم‌وایە (وە) لە کوردی خۆیدا نی‌یەو ، ئەوانەی ئەینووسن بەر پەتای لاسایی‌کردنەوەی (و)ی عەتفی عەرەبی کەوتوون . لەبەرئەوە پێڕەویی ئەم باوەڕەی خۆمم کردووە بە بناخە .

زێوەر زۆر جار (د)ی (دا)ی زەرفی‌یەتیشی کە لە دیالێکتی سلێمانیدا بە جۆرە (ی)یەکی بەمنگەوە ئەخوێنرێتەوە ، بە (ی) نووسیوە . من هەموو ئەو (ی)یانەم بە (د) نووسیوە ، چونکە ئەگەر بە (ی)م بنووسینایە ، زۆر خوێندەواری کورد کە شارەزای ئەو دیالێکتە تایبەتی‌یە نین ، نەیانئەزانی مەبەست چی‌یە .

ئەو شوێنانەش کە بەپێی زمان یا گرامەری زمان بە هەڵەم زانیون ، ئەگەر ڕاستم کردبنەوە ، لە پەراوێزدا نووسیومە لە تێکستی دەسنووسەکەدا چۆن بوون . ئەگەر ڕاستیشم نەکردبنەوە ، لەپەراوێزدا نووسیومە ئەبوو چۆن بوونایە . لێرەدا ئەبێ ئەوە بڵێم کە لەوانەیە کەسانێ هەبن بڵێن باشتر

وابوو یا هەموو ئەو بە هەڵە زانراوانەم لە تێکستی کتێبەکەدا ڕاستبکردایەتەوەو لە پەراوێزدا بمنووسی‌یایە لە دەسنووسەکەدا چۆن بوون ، یا بەپێچەوانەوە . بەڵام من خۆم لەکاتی نووسینەوەدا ڕام وا نەبوە ، لە هەندێ شوێندا وام بە باش زانیوە ڕاستکردنەوەکە بخەمە تێکستەوەو لەهەندێ شوێنیشدا وای بۆ چووم بیخەمە پەراوێزەوە . هەرچۆن بێ ، لەتێکستدا بێ یا لە پەراوێزدا ، دەقی ئەوەم نووسیوە کە زێوەر نووسیویەو مەیدانی ئەوەم بۆ خوێندەوار فەراهەم کردووە ببێ بە دەمڕاستو ڕای خۆی لە ڕاستو چەوتیی بۆچوونەکانمدا بدا .

هەروەها ئەبێ ئەوەش بڵێم کە زێوەر یەکێکە لەو بنووسە کوردانەی وەچەی یەکەمی نووسینی پەخشانی کوردیی نوێ کە لەژێر تەئسیری پەخشانی تورکیو شێوە نووسینی عەرەبی‌و فارسیدا کوردی‌یان نووسیوە . لەبەرئەوە شتێکی سەیر نی‌یە ئەگەر ناتەواوی لە شێوە نووسینیدا هەبێو جاروبار لە پێڕەوی کردنی گرامەری بەسەلیقە زانراوی کوردی لابداو بکەوێتە هەڵەوە .

وشەی عەرەبی‌یش کە بەزۆری لەم نووسینانەی زێوەردا بەرچاو ئەکەون ، خستوومنەتە سەر شێوەی کوردی ، واتە پیتە عەرەبی‌یەکانیانم کردووە بە پیتی کوردی ، تەنها لەو وشەو ڕستەو نیمچە ڕستانەدا نەبێ کە بە دارشتنی عەرەبی بەکاری‌هێناون ، لەگەڵ ئەوەش کە ڕای خۆم لە دەسکاری کردنی ئەم جۆرە وشانەدا دەق وا نی‌یە . من خۆم زیاتر بەلای ئەوەدا ئەچم وشەی عەرەبی کە بەو سیفەتە بەکارهێنرابێ بووە بە کوردی ، مامەڵەی کوردیی لەگەڵ بکرێ . ئەوەش کە بەو سیفەتە بەکارهێنرابێ هێشتا هەر وشەیەکی عەرەبی‌یە ، بە پیتی عەرەبی بەڵام بە شێوەی کوردی

بنووسرێ . بۆنموونه (سلطان) به (سوڵتان) بنووسرێ ، بەڵام (مستثنی) به (موستەثنا) بنووسرێ .

حەزیشم ئەکرد بۆمبلوایه پوختەیەکی باسی ئەو شوێنانەو مێژووی ژیانی ئەوکەسانەی ناویان لەم کتێبەدا هاتووه ، له پەراوێزدا بنووسم . بەڵام پاش بیرکردنەوه ڕامهاته سەر ئەوه که ئەمه کارێکی زۆری ئەوێ‌و لەوانەیه بەم سەرقاڵی‌یەی ئێستامەوه به ساڵێك ئەوجار بۆمبکرێ‌و هێشتا سەرچاوەم بۆ گەلێکیشیان هەر دەست‌نەئەکەوت . جگه لەوەش که من مەبەستم له بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبه ڕێ لێ گرتنی فەوتانی ئەم دوو بەرهەمەی زێوەره نەك نووسینی باسی شوێن‌و مێژووی ژیانی ئەم‌و ئەو . لەبەرئەوه ئەو بیرەم هیچ نەبێ لەمچاپەدا پشت‌گوێ خست[٢] .

ئومێدەوارم بەمکاره هەنگاوێکی باشم بەرێی تۆزی گەردوون داتەکاندندا له ڕووی کەلەپووری کوردی هەڵهێنابێتەوەو ، خوێندەواران کاتێکی خۆش لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم بەرهەمانەی زێوەری نەمردا بەسەربەرن .

(٢) بەڵام وێنەی هەندێ لەوانەم بڵاوکردەوه که ناویان لەم کتێبەدا هاتووه . زۆرم هەوڵدا وێنەی زیاترم دەسگیر نەبوو .

# بەکورتی مێژووی ژیانی زێوەر

ناوی عەبدوڵڵاو نازناوی زێوەرو ، کوڕی موحەممەد ئەفەندیی کوڕی مەلارەسووڵی بەبنەڕەت پژدەرییە .

لە ساڵی ١٢٩١ی کۆچیدا (١٨٧٥ی عیسایی) لە شاری سولەیمانی هاتووەتە دنیاوە . پاش تەواوکردنی خوێندنی قۆناغی سەرەتایی لەقوتابخانەکانی ئەو سەردەمەدا ، بووە بە فەقێو گەلێ شوێنی کوردستانی ئەمدیوو ئەودیو گەڕاوەو ، بە ١٥ ساڵ هەموو زانستەکانی مەلایەتیی خوێندووەو ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتووەو ، چوار پێنج ساڵیش مەلای مزگەوتو ماموٚستای فەقێیان بووە .

لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا چووەتە ئەستەمووڵو سێ چوار ساڵ لەوێ ماوەتەوە . بەمە ، سەرەڕای زمانە کوردییەکەی خۆیو ، سەرەڕای فارسیو عەرەبی ، کە وەك مەلایەکی مەلایانە تیایاندا زۆر شارەزا بووە ، ئاگاداریی‌یەکی باشی لە زوبانو ئەدەبی تورکیی‌یش پەیداکردووە .

پاش گەڕانەوەی لە ئەستەمووڵ بووە بە ماموٚستای نووسینو گرامەری زمانی تورکی لە (ڕوشدییەی عەسکەری) لە سولەیمانیو ، کە ئەو قوتابخانەیەش هەڵگیراوە بووە بە ماموٚستای قوتابخانەی (تەشویقییە) .

پاش داگیرکرانی سولەیمانی لەلایەن ئینگلیزەوە بووە بە باشکاتبی تەحریرات . پاشانیش کراوە بە مامۆستا لە قوتابخانەی (نموونەی سەعادەت)دا .

لەگەڵ شار بەجێهێشتنی شێخ مەحموودی حەفیددا پاش تێکچوونی فەرمانڕەوایی یەکەی ، ئەمیش سولەیمانیی بەجێهێشتووە و چەند ساڵێکی دوور لە کاری ڕەسمی بەسەربردووە . لەم ماوەیەدا هەندێ ناوچەی کوردستانی ئێران گەڕاوە .

پاش گەڕانەوەی ، کراوە بە مامۆستای سەرەتاییو تا لە ۱۹۳۸دا خانەنشین کراوە ، لە سولەیمانیو دەرەوەی مامۆستایەتیی کردووە .

لە ۱۰/۱۱/۱۹٤۸دا کۆچی دوایی کردووە .

بەرهەمی لەچاپدراوی ، جگە لەم کتێبە ، ئەمانەن :

- دەستەگوڵی لاوان (سروود) ، ۱۹۳۷ .
- خێوی ناو مزگەوت ، ۱۹٤٦ .
- بەشێکی شیعرەکانی کە لە ۱۹۵۸دا لەلایەن کتێبخانەی زێوەرەوە لەچاپ دراوە .

ئێستاش کوڕەکانی بەدەستیانەوەیە هەموو دیوانەکەی بە تێرو تەسەلی لەچاپ بدەن .

تا چند مانگیک انگلیزه‌کان معامله‌یان باش بو لە آخردا سیاستیان گوری شیخ
تحملی دسیسه و حیله‌ی اوانی نه بو مخالفه‌ی اکردن نتیجه بو شربی حکومتی وطنی و
انگلیزدا انگلیزه‌کان غالب بون شیخ اسیر کرا تفصیلات خویان بە کتیب
نوسیویانه گنجینه‌ی علاقه‌ی به سر تاریخ نوسینه وه‌نیه هر احوالی تایبه‌تی مردان
انوسی حفده سال شیخ به کشاکشی حبسی دایری مایه‌وه اما دفعی کرله بغدا
بو هردەک سلیمانی فو ناغو دیواخانی منظمی هه‌بو لە هولایکرده میوانی بو اجو
و خلقی روی اکرده درگای ادیش به دلخطی او معاشه‌ی که حکومت بوی
معلوم کردبو دواردبق املاکی کرده سلیمانیه‌وه بو اجو خدمتی میوانی اکرد
دادی بو احسان و انعام اجو بە بشی ده‌کرد دادی بو وظیفه و مأمور بیت
دخالتی پی اکرد لە وزارته‌کانا سعی بو اکرد رجای بو انوسین بو بعضی بالذات
خوی ای برد بو دایره‌ی حکومت نفوذی تأثیری هه‌بو رجایان قبول اکرد
هتا مسئله‌ی اختلاف انگلیز و عراق لە زمان رشید عالی گیلانی زاده لە بغدا
مایه‌وه که شاری بغدا کوته خطر و تهلکه‌وه مجبوراً بغدای ترک کرد روی
کرده‌وه لوای سلیمانی چو لە دارکەلی کە ملکی خوی دانیشت و حکومتیش راضی
بو بی طرفانه هر لەوی دانیشت حالی حاضر لە دارکەلی به زراعت به فلاحت
بە خدمت آینده و رونده مشغوله لای کم روزی پنجا کس بلکو زیاتر
رو اکنه دیواخانی ابی خدمتیان بکریت و زور کسیش بو انعام و احسان
اچیت خدمتی او انیشی محروم ناکا لە سادا تا که مردمانی تنها اوه ذیبو
رجای فقیران لای مأموران تصور ناکا هر کسی مراجعتی بی اکا اهمال اقتدار یا بی

لاپەڕەیەکی دەسنووسی «گەنجینەی مەردان»

## سعدی علیه الرحمة

**شرف مرد به جوداست و کرامت به سجود**
**هرکه این هردو ندارد ، عدمش به ز وجود**[1]

(١) واته : شکۆی پیاو به دەستبڵاوی‌یەتی‌و ، مەردایەتیشی به خواپەرستی‌یەتی . ئەوەی ئەم دوانەی نەبێ ، نەبوونی له بوونی چاتره . ئەمه شیعری سەعدیی شیرازی‌یه .

# گەنجینەی مەردان

ئەم گەنجینەیە گەنجێ نی یە زێڕو زیوو جەواهیری تیابێ ، بەڵکو گەنجێکە سەدهەزار بەقیمەتتر لە موجەوهەراتی تیا نووسراوە . خەزنەی مەردانە ، گەنجی پیاوانە ، ئەو پیاوانەی کە گوڵی باغی ئینسانیەت و مەردی بوون ، بە کرداری جوان جوان ڕازاونەوەو خزمەتی بەشەریان لەسەر شان ڕاگرتووەو تەماشایەکی قیامەتیشیان کردووە . لە هەموو عەسرێکا مەرد زۆر بووەو دائیما هەیە ، ئەمما هەموو مەردێ ئەو خزمەتە نابینێ وەك ئەمانەی لە (گەنجینە)دا نووسراون و ، ئەمسالیشیان زۆر بووە قابیل نی یە یەکە یەکە هەمووی بنووسرێ چونکە ئەوە باری وشترێ کاغەزی ئەوێ . بۆ نموونەو دەرسی ئەخلاق بۆ خوێندەواران چەند زاتێکم نووسیوە کە ناویان تازە بکەمەوە ، باوجوود لە گۆشەی تەئریخدا هەریەکە کەوتووەتە ناوەوە . من ویستم چەند مەردێ لەم نامیلکەدا بەیەکەوە بنووسم ، ناویان تازە بکەمەوە .

**نمرد آنکه از وی بماند به جای**
**پل و مسجد و خان و مهمانسرای** (۱)

---

(۱) واتە : ئەوەی پردو مزگەوت و خان و میوانخانەی لەپاش بەجێ بمێنێ ، نەمردووە ، ماوە .

# ئیسماعیل کوڕی ئەحمەدی سامانی

(لە «روضة الصفا» وەرگیراوە)

ئیسماعیل لە مولووکی سامانی یەکەم پادشای ناودار بووە . سەخاوەتی ، عەدالەتی ، بەرزیی هیممەتی ، عەهدو پەیمانی بەتەواوی نانووسرێ . کاتێ غاڵب ئەبێ[1] بەسەر عەمرو لەیسدا کە مەتڵووبی خەلیفەی بەغدا بوو ، وە ئەسیری کرد ، عەمر دەخالەتی کرد کە بینێرێ بۆ خەلیفە ، خۆی نەیکوژێ . جوابی بۆ ناردەوە کە من دوشمنایەتیم لەگەڵ ئەو نی یە ، لە ڕۆحی خۆی ئەمین بێ . ئەمما پێویستە گەنجوماڵو خەزنەت[2] لەکوێ داناوە تەسلیمی بکەی[3] . عەمر گوتی[4] لە خزمانی خۆم بە (سام) ناوم تەسلیم کردووە کە بیبا لە هەرات بیشارێتەوە . ئیسماعیل لەپاش فەتحی بەعزێ لە تورکستان ڕووی‌کردە هەرات . ئەهلی هەرات تکایان لێ کرد کە ئەمانیان بدا بە بێ‌شەڕ شار تەسلیم بکەن .

---

(١) ئەبوو «بوو» بوایە .

(٢) ئەبوو «خەزنەی» بوایە .

(٣) ئەبوو «بکا» بوایە .

(٤) ئەبوو «ئەڵێ» بوایە .

ئیسماعیل سوێندی بۆ خواردن‌و عەهدیشی کرد کە ڕۆح‌و ماڵیان لە ئەمانا بێ . شاری هەرات تەسلیم‌کرا . لەشکر داخڵی بوون . کەس نەیتوانی دەست لە پووشێکی ئەهالی بداو ، بۆ گەنج‌و خەزێنەی عەمرولەیس پرسیاریان‌کرد لەکوێیەو ، بۆ سام کە خەزنەی تەسلیم کرابوو ، گەڕان ، سەرو شوێنی نەبوو . لە دەوڵەت‌و سەروەتی عەمر مەئیووس بوون . ئەمیران چوونە خدمەتی عەرزیان‌کرد نوفووسی شاری هەرات سەدهەزار کەس زیاترە ، هەر سەری دینارێکیان لێ بستێنین ، سەدهەزار دینار بۆ ئێمە کۆئەبێتەوە ، وە بۆ ئەوانیش یەك دینار قەدرو قیمەتی نی‌یە . بۆ لەشکر کافی‌یە کە ئەمجارە تالأنیان چنگ نەکەوتووە . ئیمساعیل گوتی من عەهدو پەیمانم کردووە کە دەخڵیان نەکەم . ئێستا کە چۆن چەند هەزار موسوڵمانی فەقیرو هەژار بخەمە بەردەستی مواشیر پارەیان لێ بستێنن . (ساعةً) ئەمری‌کرد بە حەرەکەتی لەشکر لەناو هەراتا[5] . گوتی نەوەك وەسوەسەی شەیتانی بمخاتە سەر خەیاڵی غەدرو زوڵم‌و پەیمان شکەنی[6] . دەست‌بەجێ لەشکر بارخانەی ڕێکخست ، کەوتنە ڕێگا . مەسافەی یەك دوو سەعات دوور لە هەرات خێوەت‌و بارەگایان هەڵدا . لەشکر وەکو سەیران[7] بە هەموولایەکدا بڵاوبوونەوە . کەنیزێ لە کەنیزانی حەرەم‌سەرا ئەچێتە سەر ئاوێ خۆی بشوا ، ملوانکەی ئاڵتوونی جەواهیربەندی لەسەر جلەکانی دادەنێ . داڵێ لە هەوادا وائەزانێ ئەوە گۆشتە ، پەلاماری ئەبا بە دەنووك هەڵی‌ئەگرێ . سوار چاویان لێ ئەبێ .

---

(٥) واتە : لەشکر لە شار بچێتە دەرەوە .

(٦) واتە : پەیمان شکاندن .

(٧) واتە : وەکوو سەیران‌کەر ، یا وەکوو لە سەیرانا .

له هەموولایەکەوە بۆی سوار بوون ، شوێن داڵ کەوتن ، لەچاو گومیان نەکرد هەتا گەیشتە مابەینی دوو شاخ ، چاویان لیٚ بوو ملوانکەی فڕیٚدایە خوارەوە . سوار کە چوون سەیریان‌کرد بیریٚ بوو فڕیٚی دابوە ناو ئەو بیرەوە . یەکێکیان بە گوریس داهێشتە ناو بیرەکەوە ، کە ئەگاتە بن‌بیر تەماشا ئەکا لەغەمیٚ لە بیرەکەدا هەیە ، سەیری لەغەمەکەی کرد ، دەبینیٚ پڕە لە سندووقی ئاڵتوون‌و موجەوهەرات . خەبەری‌دا کە خەزنەی عەمر ئەوا لێرە شارراوەتەوە ، شریتی بۆ دادەیێڵن ، هەمووی دێننە سەریٚ ، ئەیبەنە خدمەت ئەمیر ئیسماعیل ، ئەویش شوکری خوای کرد ، گوتی پاداشتی ئەهلی هەراتە کە عەفوم‌کردن ، لە موجازات[8] خوا ئەمەی بۆ ناردووم . مەگەر[9] سام خزمی عەمر لە ئەترافی هەرات ئەو نەقدو موجەوهەراتەی لەترسا بردبوە ناو ئەو شاخە ، لەو بیرەدا قایمی کردبوو . خوا دەست ئەمیر ئیمساعیلی خست . ئەویش دەستی‌کرد بە ئینعام‌و ئیحسان لەگەڵ سەرداران‌و لەشکر ، هەمووی دابەش‌کرد بەسەریانا ، لەشکریش غەمی تالاٚن نەکردنیان لە دڵ دەرچوو .

ڕۆژیٚ لە هۆدەی خۆیدا مامۆستا دەرس بە ئەحمەدی کوڕی[10] ئەڵیٚ ، ڕقی لە ئەحمەد هەڵئەستیٚ ، پێی‌ئەڵیٚ خوا بەرەکەت بە خۆت‌و بە باوکت بدا . ئەمیریش بۆ خاتری مەلا شەرمەسار نەبیٚ گورج ئەچێتە دەریٚ لە هۆدەکەو کەرەم‌و عەتاشی لەگەڵ ئەکا .

---

(٨) لە موجازات : مەبەست (لەپاداشدا)یە .

(٩) مەگەر : تومەز .

(١٠) کوڕی ئەمیر ئیسماعیل .

که عەمری نارد بۆ خەلیفە ، خەلاٚت‌و فەرمانی سوڵتانیی بۆ هات . ئەویش هەر بەرگیٚ لەو خەلاٚتە کە لەبەری‌ئەکا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی پیٚوە کردووە ، هەتا هەمووی بەوچەشنە لەبەرکرد . لە ئاخردا فەرمانەکەی ماچ‌کرد ، لەسەر سەری دانا .

جاریٚ مەلایەك لە عالمانی ئەو زەمانە ئەچیٚتە خدمەت[11] . ئەمیر ئیسماعیل حەوت هەنگاو ئەچیٚت بەپیر عالمەکەوە . شەو لەخەودا بەخدمەت پیٚغەمبەر (علیه الصلوة) ئەگات ، پیٚغەمبەر ئەفەرمویٚت ئەی ئیسماعیل بە واسیتەی ئەوە کە تۆ حورمەتی عالمت گرتووە مژدەت ئەدەمیٚ لە نەسلی تۆ هەتا حەوت پشت پادشاهی‌و حوکمڕانی ئەکەن .

وەسفی چاکەی زۆرە . بۆنموونە ئەمەندە بەسە .

---

(۱۱) واتە : خزمەتی ئەمیر ئیسماعیل .

# ئۆکتای قائان کوڕی چەنگیز خان

(لە «روضة الصفا» وە)

کە ئیرادەی خوا بەوە بوو برینی ئیسلام سارێژ ببێ ، وە ڕەعیەت ڕووبکاتە ئاسایش ، چەنگیز خان لە نەخۆشیی مردنیا ئۆکتای قائانی کرد بە وەلیعەهد ، لەپاش خۆی ئەو لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانیشێ . ئۆکتای قائانیش نەیئەویست ئەو وەزیفەیە بکەوێتە سەرشانی . ئاخری بە ڕجای وەزیران وە ئەمیران وە براکانی پێیان قووبوڵ کرد کە جێنشینی باوکی بێ . حازرانی مەجلیسو لەشکرو خدمەتکاران بەجارێ لەخدمەتیا کەوتنە سەر ئەژنۆو لەقەبی (قائان)یان بۆ دانا . شازادەکان لەسەر عادەتی خۆیان لە ڕووی ڕۆژدا سێ جار سوجدەیان برد .

ئەویش ئەمریکرد خەزێنەی چەنگیز خان کە لە شەرقو غەربەوە کۆکرابۆوە ، هێنایانە پێشەوە بەسەر خزمانو سەرداران و ئەهالیو بێگانە دابەشیکرد ، فلسێکی بۆ خۆی نەهێشتەوە . کە لە بەخششو عەتا فەراغەتی کرد ، تەعامی بۆ ڕۆحی چەنگیز خان دروستکرد ، فەقیرانی لێ تێر کردو هەموو گوناهباری عەفو کردو لەشکری بەئەترافا نارد ئەو شارو مەملەکەتانەی لە زەمانی باوکیا وێران کرابوو ئاوا بکرێتەوە[1] . ئۆکتای

(۱) ئەبوو «وێران کرابوون ، ئاوا بکرێنەوە» بوایە .

قائان پادشای ئێران‌و توورا‌ن بوو ، عه‌داله‌ت شیعار ، موباره‌ك ئاسار ، هیممه‌ت بڵند ، موحیب‌و دۆستی ئه‌هلی ئیسلام ، لای وابوو که دینی ئیسلام له هه‌موو دینه‌کان چاکتره . ئاوازه‌ی سه‌خاو که‌ره‌می گه‌یشتبوه شام‌و میسرو ڕۆم . باغی ئاره‌زووی ئه‌هلی شه‌رق‌و غه‌رب له بارانی فه‌یزی ئاساری تێراو وه سه‌بزو خوڕڕه‌م بوو . له جوودو عه‌تایا گۆی هونه‌ری له پێشووان‌و دواکه‌وتووان بردبوه‌وه ، به واسیته‌ی ئه‌وه که دنیا نیوه‌ی بۆ خۆشی‌یه وه نیوه‌ی بۆ ناوچاکی‌یه .

یه‌کێ له دوشمنی[٢] ئیسلام هاته خدمه‌تی وتی ئه‌مشه‌و چه‌نگیز خانم دی له خه‌ودا پێی‌وتم به کوڕی من بڵێ موسوڵمانان بکوژێ یه‌کێکی نه‌مێنێته‌وه . ئه‌ویش نه‌ختێ ڕاوه‌ستا ، لێی‌پرسی چه‌نگیز خان خۆی ئه‌م قسه‌ی پێ وتی یا به ته‌رجومان ؟ وتی هه‌ر خۆی پێی‌وتم . قائان وتی تۆ زوبانی مه‌غوولی ئه‌زانی ؟ کابرا وتی نا . ئه‌مجا پێی‌وت چه‌نگیزخان غه‌یری زوبانی مه‌غوول هیچ زوبانێکی نه‌زانیوه ، که‌واته تۆ درۆئه‌که‌ی . ئه‌مری‌کرد له باتیی موسوڵمان[٣] جارێ خۆی بکوژن . پیاوه‌که جووله‌که بوو ، به جه‌زا کوشتیان .

عاده‌تی مه‌غوول وابوو له به‌هارا ، له هاوینا ده‌ست‌وپه‌ل له جۆگه ئاودا نه‌شۆن ، به زه‌رفی زێڕو زیو ئاو هه‌ڵنه‌گرن ، کراس‌و لیباسی شۆراو له ده‌شتا هه‌ڵنه‌خه‌ن ، چونکه ئه‌م ئیشانه به عه‌قیده‌ی ئه‌وان ئه‌بێته سه‌به‌بی زۆریی چه‌خماخه‌و برووسکه‌و به‌فرو باران . مه‌وقیعه‌که‌شیان وایه له ئه‌ووه‌ڵی به‌هار تا ئاخری هاوین ئه‌بێته زۆری[٤] هه‌ورو چه‌خماخه‌و ، ئه‌هالیشیان له‌و

(٢) ئه‌بوو «دوشمنانی» بوایه .

(٣) ئه‌بوو «موسوڵمانان» بوایه .

(٤) ئه‌بوو «زۆر ئه‌بێته . .» بوایه .

حەرەکاتە مەنع ئەکرد چونکە شیددەتی برووسکەو گرمەی هەور بەدەرەجەیەکە لەترسا لەناو خانووش ئارامیان نەبوو[٥] . رۆژێ قائان لە ڕاو ئەهاتەوە موسوڵمانێکیان چاو پێ کەوت لەناو ئاودا خۆی ئەشوشت . لەشکر گرتیان ، تەمایان بوو بیکوژن ، وتی جارێ بمێنێ ، منیش تاقەتم نی یە بۆ سوئال‌و جواب ، بیبەن ئیمشەو حەبس بێ ، سبەینێ تەحقیقاتی ئەکەین کە بۆچ بێ‌ئەمری‌و بێ‌قانوونیی کردووە ؟ موسوڵمانەکەی تەسلیم بە دانشمەندی پەردەداری[٦] کرد کە شەو لای ئەو مەحفووز بێ‌و خۆشی بەدزی‌یەوە بالەشێ[٧] ئاڵتوونی نارد خستیانە ئاوەکەی کە مەلەی تیا کردبوو و خەبەریشی بۆ نارد سبەی کە لێیان پرسی بڵێت کیسە پارەم کەوتبوە ناو ئاوەکە ، چووم بۆی بگەڕێم ، لەوکاتەدا قائان بە خۆی‌و لەشکریەوە هات بەسەرما ، بۆم نەدۆزرایەوە . لەبەر پارەکەم کە لەکیسم نەچێ ئەم ئیشەم کردووە . کە چاوم بە لەشکر کەوت لەناو ئاوەکەدا شاردمەوە نەوەك لێم بستێنن . موسوڵمانەکە سبەی ئەم تەقریرەی دا . قائان وتی کەس ناتوانێ لە ئەمرو قانوونی ئێمە تەجاوز بکا . ناردیان بالەشەکەیان لە ئاوەکە دەرهێنا لای قائان دایان‌نا . وتی ئەم بێچارەیە لەترسی پارەکەی ئەم ئیشەی کردووە . ئەمە فەقیرە بێ‌عیلاجە[٨] . ئەمری‌کرد دە بالەشی‌تریان بۆ هێناو نەسیحەتیان‌کرد جارێکی‌تر ئەم موعامەلەیە نەکا .

---

(٥) ئەبوو «نەئەبوو» بوایە .

(٦) پەردەدار : حاجیب ، وەك (سکرتێر)ی ئەم سەردەمە وابوە .

(٧) بالەشی زێڕ عیبارەتە لە هەشت دینارو دوو دانگ . بالەشی زیو هەشت درهەم‌و دوو دانگ – زێوەر .

(٨) بێ‌عیلاج : ناچار .

قائان زۆر حەزی لە سەیری پاڵەوان‌و زۆرانبازی ئەکرد . هێندێ لە زۆرانبازی عێراق‌و خوراسان چوون بۆ مەجلیسی قائان ، خەبەریان نارد بۆ لای چورماغوون کە پاڵەوانەکانی قائان ڕەوانە بکا بۆ (قەراقروم) . چورماغوون سی ئولاغ ئالیك‌و خواردەمەنیی بۆ پاڵەوانەکانی خۆیان کە فیلەو مەحموودشاەو ڕەفیقەکانیان بوون ، ڕێکخست . ڕەوانەی‌کردن بۆ قەراقروم . قائان شکڵ‌و هەیئاتی فیلەی لەلا زۆر موناسب بوو ، پێی خۆش‌بوو . ئەمیر ئێلچیگدای وتی حەیف بۆ ئەم مەسرەفە زۆرە کە بۆ ئێوە کراوە ، هەمووتان خەسار کردووە . قائان وتی تۆ پاڵەوانی خۆت بێنە ، ئەگەر سەرکەوتن پێنج‌سەد ئەسپت ئەدەمێ‌و ئەگەر ژێرکەوتن تۆ پێنج‌سەد ئەسپ بدە . لەسەر ئەم موقاوەلە قەراریان‌دا . کە شەو هات قائان فیلەی بانگ‌کرد . ئیشارەتی ساقی‌یانی کرد بە مەرامی فیلە بزووتنەوە . لەپاشا سوجدەی برد . عەرزی‌کرد موافیقی ڕەزای قائان ئیش ئەکرێ . ڕۆژی ئاخر ئێلچیگدای لە تاقمی خۆی پاڵەوانی هێنا ، لەگەڵ فیلە کەوتنە زۆرانبازی . ئەوەڵ‌جار پاڵەوانی مەغوول فیلەی دا بە زەویدا . فیلە گوتی بە هەموو هێزی خۆت من ڕاگیر بکە . لەپاش ئەوە بەو حیلەو فێڵەی کە ئەیزانی پاڵەوانەکەی مەغوولی وا دا بە زەویدا ، دەنگی ئێسقانی بەدەنی هات . قائان چووە سەر زۆرانگرەکان بە فیلەی گوت دوشمنی خۆت چاك پارێزگاری بکەو ، بە ئێلچیگدای وت چۆنە ئەسپ‌و ئالیکیان حەڵاڵە یا خەسارە ؟ بنێرە پێنج‌سەد ئەسپ بێنن‌و ئینعام پێنج‌سەد بالەش بەوو پێنج‌سەد بە مەحموودشاەو ، بە ڕەفیقەکانیان یەکی سەد بالەش بدرێت .

پیاوێك لە کەسێکی ڕاستگۆوە ئەگێڕێتەوە وتوویە لە زەمانی سوڵتان عەلائەددینی سەلجووقیدا لە ڕۆم بووم ، یەکێ بوو نانی لە

مەسخەرەچی یەتی ئەخوارد . لەوکاتەدا ئاوازەی کەرەمی قائان دنیای داگیرکردبوو کە پادشاهێکی مەغوول زێرو زیوی لەلا وەك خاك وایە . ئەم کابرایەش وەسوەسەی پەیدا کرد کە بچێتە قەراقروم لە خوانی نیعمەتی قائان چەند لوقمەیێك بفرێنیٚ ، نە زادی هەبوو نە پارە ، چەندکەسیٚ ئیعانەیان بۆ کۆکردەوە گویٚدرێژێکیان بۆ کڕی کەوتەڕیٚ بۆ تورکستان . لەپاش سیٚ ساڵ بە بازاڕا ئەڕۆیشتم یەکێکم دی لە تەجەللیو لیباسێکی تەواودا بوو ، سواری ئەسپیٚ بووبوو . کە چاوی بە من کەوت دابەزی ، دەستبۆسی[9] لەگەڵ کردم ، بردمیە ماڵی خۆیان ئەنواعی خواردنو مەشرووباتی حازرکرد ، ئەغڵەبی لەناو زەرفی زێرو زیودا بوو ، خدمەتکارانی خەتایی لە بەردەستیا وەستابوونو ئەسپی چاك لە تەویلەیدا بەسترابووەوە . منیش ئەوم نەدەناسی . هەتا سیٚ ڕۆژ بەمچەشنە خدمەتو میوانداریی کردم . ڕۆژی سیٚیەم وتی من فلاٚنکەسم کە لە ڕۆمەوە بە سواریی گویٚدرێژ چووم بۆ تورکستان . میقداریٚ میوەی وشکم پەیداکرد ، چووم لەسەر ڕێگای قائاندا دانیشتم . کە هات لەدوورەوە چاوی بە من کەوت ، سوارێکی بە غار نارد بزانیٚ من کێمو چیم ؟ سوارەکە هات لێی پرسیم چ کەسیو لەکوێوە هاتووی ؟ منیش وتم لە ولاٚتی ڕۆمەوە بە ئومێدی ئیحسانی پادشاە ڕووم کردوەتە ئەم ولاٚتە ، وە دیارییش ئەم میوەم بۆ هێناوە . تەسلیمی سوارەکەم کرد . سوار کە ئەچێتەوە خدمەتی قسەی منی بۆ ئەگێڕێتەوە . قائان میقداریٚ لە میوەکە ئەدا بە ئەمیرانیو خۆشی نەختێکی لیٚ ئەخوا . باقیی ئەخاتە جانتای خۆی .

---

(٩) دەستبۆس : دەست ماچکردن .

سوارەکان (ظاهراً) بە چاوی نارەزایی تەماشای قائان ئەکەن . ئەویش فەرقی پیٚ ئەکا ، پیٚیان ئەڵیٚ ئەم پیاوە لە جیٚگایەکی دوورەوە رووی‌کردووەتە ئیٚمەو ئەم دیاری‌یەشی بەسەر زۆر جیٚگای موبارەکا هاتووە ، بە خدمەت زۆر زاتی موبارەك گەیشتووە . فەیزو بەرەکەت لە نەفەسی ئەم نەوعە کەسانەدا دەست‌ئەکەویٚو ئەو میوەی بە تەبەرروك هەڵم‌گرتووە[١٠] ئەیدەم بە ژن‌و منالٚو ئیٚوەش ئەبیٚ بە تەبەرروك لەناو خۆتانا بەشی‌بکەن . ئەمەی وت‌و هەڵی‌گرتە غار . رۆیی ، کە گەیشتە بارەگا لە دانشمەندی پرسی پیاوەکەی لە رۆمەوە هاتبوو کوا ؟ دانشمەند وتی نازانم .

لیٚی توورە بوو ، وتی ئیٚوە چۆن موسوڵمانیٚکن ؟ هاودینی خۆت لە رۆمەوە هاتووە ، غەریب ، بیٚ‌جیٚگاو ریٚگا ، بیٚ‌ئاوو نان ، لیٚت نەپرسیوەتەوە . ئەبیٚ بچی بیدۆزی‌یەوە لای تۆ میوان بیٚ هەتا ئەگەریٚتەوە بۆ رۆم . منیش لەناو لەشکرا بووم ، کە روانیم بەشویٚنما ئەگەریٚن . منیان دۆزی‌یەوە[١١] ، بردمیانە ماڵی دانشمەندی پەردەدار ، ئەویش دەستی‌کرد بە خدمەت کردنم . رۆژی ئاخر[١٢] مەملەکەتیٚ فەتح کرابوو هەفت‌سەد باڵەشیان بۆ هیٚنا . ئەمری‌کرد هەموویان دا بە من . منیش لە میحنەتەوە کەوتمە راحەت‌و ، لە نەگبەتەوە دەوڵەت رووی تیٚ کردم ، بووم بەم پیاوە کە ئەمبینی .

---

(١٠) (ظاهراً) میوەی وشك میٚوژ بوویٚ – زیٚوەر .

(١١) ئەبوو «دۆزیمیانەوە» بوایە .

(١٢) واتە : سبەینیٚی ئەورۆژە .

یەکێکی تر : پیاوێکی پیر لە بەغداوە دێت بۆ قەرەقروم لەسەر ڕێگای قائان دائەنیشێ . کە قائان هات وە چاوی بە پیرەکە کەوت بانگی کردە پێشەوە ، وتی لەکوێوە هاتووی ؟ پیرە وتی لە بەغداوە هاتووم ، لە ماڵا دە کچم هەیە ، لەبەر فەقیریو ئیحتیاجی ناتوانم بەشوویان بدەم . قائان فەرمووی حاڵی خۆت بۆچ عەرزی خەلیفە نەکردووە ؟ پیر وتی هەمووجارێ کە سەدەقەم لە خەلیفە داوا کردووە لە دە دینار زیاتریان نەداومێ ، ئەم میقدارەش لە نانو سەبزە زیاتری پێ نەکڕاوە . قائان فەرمووی هەزار باڵەشی بدەنێ . نزدیکان[13] عەرزیانکرد ئەم مەبلەغە لەسەر ئەهالی (خەتا) ئەنووسین . وتی لە خەزێنە تەسلیمی بکەن . موافیقی ئەمر هەزار باڵەشیان بۆ هێنا بۆیان دانا . پیر وتی من پیاوێکی پیر وە بێهێزم لە دوو باڵەش زیاتر ناتوانم هەڵبگرم . قائان وتی ئولاغو ئەسبابی سەفەری بۆ ئامادە بکەن . پیر وتی بەم هەموو نیعمەتەوە من ناتوانم بگەمەوە وڵاتی خۆم ، یا جەردە لێم ئەستێنێ یا لە ڕێگا ئەمرم ، کچەکانم لەم نیعمەتە بێبەش ئەبن . قائان فەرمووی دە سواری مەغوول بۆ موحافەزە لەگەڵی بڕۆن . مەغوولان لەگەڵ پیرە کەوتنەڕێ بۆ بەغدا ، بێچارە لە ڕێگا وەفاتیکرد . ئەم خەبەرە گەیشتەوە لای قائان ، پرسی ناوونیشانەی خانووی خۆی گوتووە ؟ عەرزیانکرد بەڵێ . ئەمریکرد بیبەنە ماڵەکەی تەسلیمی کچەکانی بکەن وە پێیان بڵێن قائان سەدەقەی بۆ ئێوە ناردووە کە سەرفی جیازیو بووکیەتیی خۆتانی بکەن .

کچێك لە خزمانی قائان بەشوودرا . ئەمریکرد سندووقێ مرواری بێنن . سندووقیان هێنا . قائان مەشغووڵی شەرابخواردن بوو ، فەرمووی

(١٣) واتە : دەستوپێو بەردەستەکانی .

ئەم سندووقە لە خۆتان دابەش بکەن . کە بەش کرا حازران عەزریان کرد ئەم مرواری یە بۆ ئەو کچە هاتبوو ئەمرت کرد دابەش بکرێت ، فەرمووی بچن سندووقێکی تر بۆ ئەو بێنن .

یەکێکی تر : ئەتابەکی فارس تەهەمتەنی برای خۆی بۆ خدمەت پادشا نارد ، لەناو دیاری یەکانیا دوو قەڕابە مرواریی تیا بوو . قائان زانیی کە مرواری لای ئەوان زۆر بەقیمەتە ، فەرمووی سندووقیٚ پڕ لە جەواهیرو مرواری حازر بکەن . تەهەمتەن و حازرانی مەجلیس لە چاوپێکەوتنی هەموو موتەحەییر بوون . قائان فەرمووی ئەم مرواری یانە بکەنە ناو پیاڵەی شەرابەوە ، هەرکەسیٚ نۆبەتی هاتە سەر مرواری یەکە بۆ خۆی هەڵگریٚ بیکاتە کیسەی خۆیەوە .

یەکێکی تر : قانوونیان وابوو هەرچی حەیوانی هەیە نابیٚ سەری ببڕێت[١٤] ، ئەبیٚ لەسنگەوە هەڵیدڕن . ڕۆژیٚ موسوڵمانیٚ لە بازاڕ مەڕێك ئەکڕێت ئەیبا بۆ ماڵەوە ، جاسووسی شوێن ئەکەویٚ بزانیٚ چیی لیٚ ئەکا . موسوڵمانەکەش کە چووە ماڵەوە دەرگاکەی داخست ، مەڕەکەی سەربڕی . جاسووس چووە سەربان لەوێوە هاتە خوارەوە موسوڵمانی گرت ڕایکێشا بۆ دیوان . کە گەیشتە قاپیی حوکوومەت کردی بە هەرا هەرا کە ئەم موسوڵمانە مەڕی سەربڕیوە . قائان پرسی ئەوە چی یە ؟ بانگی کرد پرسیاری لیٚ کردن . گوتیان ئەم موسوڵمانە بیٚ ئەمری ئێوە مەڕی سەربڕیوە .

---

(١٤) لە دەسنووسەکەی زێوەردا بەمجۆرە نووسراوە : «هرچی حیوانی هەیە نابی سر ببریت» . کەواتە واش ئەخوێنرێتەوە کە من نووسیومەتەوەو ، واش ئەخوێنرێتەوە : «هەرچی حەیوانیٚ هەیە نابیٚ سەر ببڕێت» . من یەکەمیانم لا پەسەندتر بوو .

که تەحقیق کرد ئەمری‌کرد موسوڵمانەکە عەفو بێ چونکە لەترسی من بەدزی‌یەوە سەری‌بڕیوە ، جەزا ئەبێ بۆ ئەم تورکە بێ‌کە شوێنی کەوتووە . جاسووس تووشی جەزا بوو ، موسوڵمان نەجاتی بوو .

یەکێکی‌تر : لۆتی‌و سیحربازی خەتایی هاتبوون شتی عەجاییبیان ئەکرد ، سوورەتی ڕەنگ‌ڕەنگیان نیشان‌ئەدا ، یەکێ لەوانە سوورەتی پیرێ بوو کە سەرو مێزەری بە کلکی ئەسپێکەوە بەسترابوو ڕای‌ئەکێشا . قائان پرسی ئەمە چی‌یە ؟ لۆتی‌یەکان عەرزیان‌کرد ئەمە سوورەتی موسوڵمانی یاخی‌یە بەم‌ڕەنگە ئەسیرمان ڕائەکێشن‌و ئەزیەتمان ئەدەن . قائان فەرمووی جارێ یاری‌یەکە مەکەن ، بچن دەفتەری تەبەڕڕوکاتی ماوەرائولنەهرو خۆراسان‌و فارس‌و عێراق عەرەب‌و عەجەم حازربکەن . چوون بۆیان هێناو مەتاعی خەتائی‌یانیشیان هەموو هێنا . کە بەرابەری کردن فەرقیان زۆر بوو ، تەبەڕڕوکاتی ئیسلام چەند قاتی خەتائی بوو . ئەمجار وتی دەروێشێکی ئیسلام دە کەسی لە خەتایی کردووە بە دیل ، ئەمیرێکی خەتائی هەتا ئیستا موسوڵمانێکی دیل نەکردووە . ئەمە دەلالەت ئەکا لەسەر مەرتەبە زۆریی ئیسلام ، وە هەم قانوونی چەنگیز خان وابووە لەباتی خوێنی موسوڵمانێ چل بالەش زێڕ بدرێ ، وە بۆ خوێنی خەتایی یەك گوێ‌درێژی قەراردراوە . بەم دەلیل‌و ئیسباتانە چۆن بە سووکی‌و بێ‌حورمەتی تەماشای موسوڵمانان ئەکەن ؟ ئەمجارە ئێوەم بەخشی ناتانکوژم ، جارێکی‌تر ئەم یاری‌یە نەکەن .

یەکێکی‌تر : لە شاهانی ئێران شاهێ لە مەقامی ئیتاعەو گەردن‌کەچیدا چووە حوزووری . لەناو ئەو دیاری‌و هەدیە کە بردبووی لەعلێکی تیابوو کە

به ئیرس دەستی کەوتبوو ، لەسەر لەعلەکە کەلیمەی موبارەکەی (محمد رسول الله) و ناوی ئەجدادی پێغەمبەری تیا نووسرابوو . قاثان ئەمری کرد حەکاك ناوی هەموویان مەحو بکاتەوە غەیری ئیسمی (محمد رسول الله) وە لەژێر ئیسمی (محمد رسول الله) ناوی خۆی بنووسن .

یەکێکی تر : دەروێشی چەند پارچە ئاسن تیژ ئەکا ، بەدارەوە قایمیان ئەکا ، لەسەر ڕێگای قاثان ڕائەوەستێ ، لەدوورەوە چاوی پێ ئەکەوێ[15] ، سوارێك ئەنێرێ : بزانە[16] ئەو فەقیرە چیی ئەوێ ؟ سوار چوو لێی پرسی ئیشت چی یە ، چکارەی ؟ وتی فەقیرم ، ئەم درەوشانەم دروست کردووە بەدیاری هێناومە بۆ قاثان . سوارەکە درەوشەکانی لێ وەرئەگرێ . ئەگەڕێتەوە بۆ خدمەت . قاثان لێی پرسی چی بوو ؟ سوارەکە وتی فەقیرە درەوشی بەدیاری هێناوەتە خدمەت . فەرمووی بزانم چۆنن ؟ درەوشەکانی تەماشا کرد . وتی ئەمانە بۆ شوانو گەلەوان زۆر لازمە مەشکەی پێ بدوورنەوە . ئەمری کرد لەجیاتیی هەر درەوشێ بالەشێکی بدەنێ .

یەکێکی تر : ڕۆژێ پیاوێکی ئیختیار دێتە خدمەتی عەرزی ئەکا هاتووم سەد بالەشم بدەیتێ کاسبیی پێوە بکەم . قاثان ئەمرئەکا دووسەد بالەشی بدەنێ . خەزنەدار وە خدمەتکاران عەرزی ئەکەن ئەم پیرە عومری ئەوەندە نەماوە بتوانێ کاسبی بکا ، بۆچی ئەو میقدارەی بدرێتێ ؟ قاثان وتی ئەم پیاوە لە موددەتی عومریدا ئەم خولیاو خەیاڵەی بووە ، بام مەقسوودی

(١٥) واتە : قاثان چاوی بە کابرا ئەکەوێ .

(١٦) واتە : ئەڵێ بزانە . .

بێتەجێ . بردیان بۆ خەزنە پارەکەی تەسلیم بکەن ، ژمارەی تەواو نەبوو هەر لەوێدا مرد .

یەکێکی تر : گەنجنامەیەکیان دۆزی‌یەوە کە ئەفراسیاب لە فلاٚن مەکان گەنجێکی داناوە بە گاوگەردوون لەبن‌نایەت . ئەو مەوقیعەش بە جێگای شازادەکانی چەنگیزی نزیك بوو . کە باسی گەنجی ئەفراسیابیان بۆ خوێندەوە وتی ئێمە ئیحتیاجمان بە خەزنەی کەس نی‌یە ، ئەوی خۆم هەمە ئەیبەخشم‌و بلاٚوی ئەکەمەوە بەسەر بەندەی خواو تەبەعەو لەشکردا ، زیاترم ناوێ .

یەکێکی تر : توجارێ پێنج‌سەد بالەشی لە خەزنە وەرگرت تیجارەتی پێوە بکا . لەپاش موددەتێ هاتەوە بە عوزری بێ‌مەعناوە کە بالەشەکان نەماون ، زەرەرم کردووە . قائان ئەمری‌کرد پێنج‌سەد بالەشی‌کەیان داپێ . ساڵێکی‌تر لە ئەوەڵجار زیاتر بە موفلیسی هاتەوە . عەرزی قائانیان کرد کە فلاٚن‌کەس بالەشەکانی هەموو خواردووە . ئەفەرموێ بالەش چۆن ئەخورێ ؟ وتیان فرۆشتوویە بە پارە ، پارەکەی داوە بە جل‌و بەرگ‌و خواردەمەنی . قائان وتی کەواتە بالەشەکان هەمووی ماوە ، لای ئەو نی‌یە لای ڕەعیەتی‌ترە ، نەفەوتاوە . ئەوەندەی‌تری بدەنێ ئەمما نەسیحەتی بکەن ئەوەندە ئیسراف‌و زیادەخۆری نەکا .

یەکێکی تر : ئەهلی خەتایی بۆ شکات هاتنە خدمەتی عەرزیان کرد پێنج‌هەزار بالەش پارەی توجار قەرزدارین ، لەدەستمانا نی‌یە بەجارێ ئەم قەرزە بدەینەوە . ئێمە ئەڵێین بە قیست بە مانگ ئەیدەین ، توجار لێمان قوبوولێ ناکەن . قائان کە لە شکاتەکە حاڵی بوو خەیاڵی‌کرد لە دڵدا وتی

توجار پارەی دەست نەکەوێتەوە بە چی کاسبی بکا . ئەهالیش ئەم میقدارەیان بەجارێ لێ بسێنرێ مەحوو پەرێشان ئەبن . ڕووی تێ کردن ، فەرمووی خۆتان‌و ساحێب قەرز سبەی بێن بۆ خەزنە ، ئەوی قەرزی هەیە سەنەدی بنوێنێ لە خەزێنە قەرزەکەی وەربگرێت . ئەهالی بە دڵخۆشی ئەوشەوە ڕایانبوارد . بەیانی لەگەڵ ساحێب قەرز ڕوویان‌کردە خەزنە دەستیان‌کرد بە قەرز وەرگرتنەوە . هی‌وا هەبوو غەشی ئەکرد زیاد لە حەقی خۆی ، بەشەریکی لەگەڵ ئەهالی وەری‌ئەگرت . ئەهلی خەتایی بەجارێ قەرزیان لەسەر لاچوو ، بە دڵخۆشی گەڕانەوە بۆ خەتا .

یەکێکی‌تر : پیاوێ لە جێگا ڕاوی قائانا سێ شووتیی بۆ برد . قائان کە پارەو زێڕو بەرگیان پێ نەبوو ، ئیشارەتی کردە تووکا خاتوونی حەرەمی کە دوو دوڕی بەقیمەتی[17] لە گوارەکەیا بوو ، بیدەنێ . وتیان فەقیرێ قەدری ئەم دوڕانە نازانێ ، سبەینێ بێتەوە هەرچی حازر بێ وەری‌بگرێت . قائان وتی ئەم فەقیرە تەحەمولی ئەوەی نی‌یە هەتا سبەینێ بوەستێ . عادەتی مەردی[18] سەخی ئەوە نی‌یە کە وەعدە بدەن‌و بەمەشەققەت بیدەن . ئەم مرواری‌و ئەڵماسانە ئاخری دێتەوە بۆ خۆمان . لەسەر فەرموودەی قائان دوڕەکانیان تەسلیم ساحێب شووتی کرد . بەخۆشی گەڕایەوە ، چوو فرۆشتی بەقیمەتێکی کەم . موشتەری وتی ئەم ئەڵماسانە قابیلی قائانە ، بە ناوی دیاری‌یەوە بردی بۆ قائان . وتی[19] ئەمە

---

(١٧) ئەبوو «بەقیمەت» بوایە .

(١٨) بە نیشانەی «بدەن»و «بیدەن»ەکەی پاشەوەدا ، ئەبوو «مەردانی» بوایە .

(١٩) فاعیلی «وتی» ئەگەڕێتەوە بۆ قائان نەك بۆکابرای موشتەری کە دوڕەکانی بەدیاری بۆ بردووە ، وەك سیاقی ڕستەکە وائەگەیەنێ .

ئەو مرواری‌یانەیە کە وتم دێتەوە لای خۆمان. تەسلیم بە تیمووکا خاتوونی[٢٠] کردەوەو ئەوکەسەش کە بۆی هێنایەوە بە ئەنواعی عەتا مەسرووری کرد[٢١].

ساحێبی (روضة الصفا) ئەفەرموێ: ئەلحەق ئەو زەمانە ئیجابی بە کەرەم‌و مرووەت کردووە، ئیستا کە تەئریخی نۆسەدی هیجری‌یە بە حیکمەت شت ئەبەخشن، لە سەددی ڕەمەق زیاتر ئینعام نەماوە. غەڵەتم وت ئەم سەخاوەتی بەئیعتیداله بەنەزەر بەعزێ زاتەوەیە، وەئیللا ئیستاش مەردی‌وا هەیە لە ئیسراف‌و بەخشش‌و کەرەما نە قائان وە نە تایفەی بەرمەکی هێشوویان لەپشتەوە ناکەن[٢٢].

یەکێکی‌تر: پیاوێك دوو تیری برد بۆ قائان، بەئەژنۆدا دانیشت. پادشا فەرمووی بزانن ئەم پیاوە ئیحتیاجی چی‌یە، بۆچی هاتووە؟ پیاوەکە وتی سەنعەتی من تیر دروست‌کردنە. هەفتا بالەش قەرزدارم، ئەگەر ئەم قەرزەم بدرێتەوە تەعەهھود ئەکەم سالی دووهەزار تیر تەسلیمی سوپای قائان بکەم، قائان فەرمووی ئەم پیاوە لە ئیحتیاجی‌یەوە مەجبوور

---

(٢٠) لێرەدا ناوی ژنەکەی قائان «تیمووکا»یە، کەچی لەپێشتر «تووکا» بوو.

(٢١) وا ڕەساتر بوو ئەم ڕستەیە بەم‌جۆرە دارێژێ: ئەوکەسەشی کە بۆی هێنایەوە، بە ئەنواعی عەتا مەسروور کرد.

(٢٢) لەناو جووتیارانی دروێنەکەردا ئەڵێن دروێنەکەری چاك ئەوکەسەیە کە هیچ گوڵە گەنمێ یا گوڵە جۆێ لەدوای خۆی جێ‌ناهێڵێ بۆ گوڵۆچن. بەو جۆرە کەسانە ئەوترێ «کەس هێشوویان لەپشتەوە ناکا» یا «دەسکیان لە دوو ناکا»، واتە لەدرەودا هیچیان لێ بەجێ‌نامێنێ. ڕستەکە بووە بە کینایە بۆ ئەوکەسانەی کار بە باشی‌و بێ هیچ ناتەواوی‌یەك ڕائەپەڕێنن، بەجۆرێ هیچی لێ نەمێنێتەوە کەسی‌تر بیکا.

بووه که تەعەهھودێکی‌وا بکا . سەد باڵەشی بدەنیٚ سەرفی ئیحتیاجیی خۆی بکات . دەست‌بەجیٚ سەد باڵەشیان بۆ هێنا . تیرگەر لە هەڵگرتنی عاجز بوو ، قائان پێکەنی . عەرەبەیەکیان بۆ هێنا کە پێی نەقڵ‌بکا بۆ ماڵی خۆیان .

یەکێکی‌تر : لە زەمانی بینای قەرەقروم کە پایتەختی مەغوول بوو چووە خەزنە تەماشای‌کرد سەد باڵەشی تێدا ماوە ، ئەمری‌کرد هەرکەس بۆخۆی بچیٚ لە خەزنە باڵەش بێنیٚ . بەجاریٚ ئەهالی‌و خدمەتکار ڕژانە ژووری خەزنە باڵەشەکانیان فڕاند .

یەکێکی‌تر : لە زەمانی پێشوو لە شیددەتی سەرما زەراعەت سەوز نەدەبوو . کە قائان بوو بە پادشا هەوا ئیعتیدالی پەیدا کرد . ئەهالی دەستیان‌کرد بە زەراعەت . پیاوێك تووری پێگەیاند . بردی بۆ خدمەت قائان . فەرمووی بەقەدەر گەڵای توورەکە باڵەشی بدەنیٚ . ژمارديان سەد گەڵای پێوەبوو . کابرا سەد باڵەشی وەرگرت‌و بەخۆشی گەڕایەوە .

یەکێکی‌تر : قائان لەسەر گردێك لەنزیك قەرەقروم قەسرو عەمارەتێکی دروست‌کردبوو ناوی نابوو (ترغوبالق) . پیاوێك لەنزیك ئەو کۆشکە چەند نەمامێکی ڕواند . (اتفاقاً) نەمامەکان سەوز بوون . لەپێش ئەودا کەس نەمامی نەڕواندبوو و نەیاندیبوو . قائان کە پـێـی‌زانی فەرمووی بە عەدەدی هەر نەمامیٚ باڵەشێکی بدەنیٚ .

یەکێکی‌تر : قائان کە لەسەر تەخت دانیشت‌و بوو بە پادشا ئاوازەی کەرەم‌و سەخای ئەو دنیای پڕکرد . لە هەموو مەملەکەتیٚ توجارو بازرگان

ڕوویان‌کرده وڵاته‌که‌ی . بازرگانه‌کان بۆخۆیان نرخی ئه‌شیایان ئه‌نووسی ، ده‌فته‌ریان ته‌قدیم ئه‌کرد . قائان له‌ڕووی ئیحسان‌و که‌ره‌مه‌وه هه‌ر له ده باڵه‌ش یه‌کێکی زیادی بۆ حیساب ئه‌کردن . خدمه‌تکاران عه‌رزیان‌کرد بازرگان قازانجی خۆی حیساب کردووه ، له ده بۆچی زیاتریان بده‌ینێ ؟ قائان وتی ئه‌وانه‌ی ڕوو له ده‌رگاو حوکوومه‌تی ئێمه ئه‌که‌ن بۆ مه‌نفه‌عه‌تی زۆره‌و هه‌م خدمه‌تی ئێوه‌ش ئه‌که‌ن . ئه‌مه قه‌رزی ئێوه‌یه ئه‌یده‌مه‌وه .

کێکی تر : له هینده‌وه چه‌ند شه‌خسێ دوو ددانی فیلیان بۆ هێنا . وتی لێیان بپرسن به‌ئومێدی چه‌ند هێناویانه ؟ هیندی‌یه‌کان وتیان پێنج‌هه‌زار باڵه‌ش . فه‌رمووی ئه‌و میقداره‌یان بده‌نێ . مه‌ئمووران وتیان هیندی ڕه‌عیه‌ت نین ، دوژمنن . ئه‌م میقداره زۆره بۆ شتێکی‌وا بێ‌قه‌در . وتی من دوشمنی که‌س نیم وه که‌سیش دوشمنی من نی‌یه .

یه‌کێکی‌تر : ئه‌هلی خۆراسانی کڵاوێکیان بۆ هێنا له‌چه‌شنی کڵاوی خۆیان . له‌وه‌قتێکا که بوخاری شه‌راب له سه‌ری دابوو[٢٣] ، مه‌شغووڵی عه‌یش بوو ، غه‌رزیان‌کرد ، فه‌رمووی دووسه‌د باڵه‌شیان بده‌نێ . خه‌زنه‌دار ئه‌مره‌که‌ی ڕاگیرکرد پاره‌که‌ی نه‌دا ، گوتی ئه‌مه خه‌یاڵی سه‌رخۆشی‌یه . که هاته‌وه سه‌ر خۆی خۆراسانی‌یه‌کان چوونه‌وه حوزوور که باڵه‌شیان ته‌سلیم نه‌کراوه ، ئه‌مری فه‌رموو سێسه‌د باڵه‌شیان بده‌نێ . دووباره خه‌زنه‌دار ئه‌مره‌که‌ی ڕاگیرکرد . قائان خه‌به‌ری زانی ئه‌مری‌کرد شه‌ش‌سه‌د باڵه‌شیان بده‌نێ‌و ئیراده‌ی کرد هه‌موو ئه‌میران‌و سه‌رداران‌و خه‌زنه‌دارو خدمه‌تکار له خدمه‌تیا کۆببنه‌وه . هه‌موو هاتن . هه‌رکه‌س به

---

(٢٣) واته : سه‌ری گه‌رم بووبوو و سه‌رخۆش بوو .

دەرەجەی خۆی جێگای گرت . ئینجا ڕووی تێ کردن وتی لە دنیادا هیچ شتێ هەیە هەر بمێنێ‌و نەفەوتێ ؟ وتیان نەء ، هەموو شتێ[٢٤] نامێنێ . خۆی وتی بەڵێ ناوی چاك ، ئاساری چاك لە دنیادا پایەدارە ، ئەمێنێ . ئێوە ناتان‌ئەوێ[٢٥] من ناوم لە دنیادا بمێنێ ، بۆیا[٢٦] لە بەخشش مەنعم ئەکەن ، نامەوێ ئەم نەسیحەتانەم بکەن .

یەکێکی‌تر : لەکاتێکا کە ئەهلی شیراز لە ئیتاعەدا بوون ، یەکێك هات لەپێش تەختی قائانا ئەژنۆی دانا ، وتی ئاوازەی ئینعام‌و ئیحسانی ئێوە دنیای پڕکردووە . منیش پێنج‌سەد بالەش قەرزارم ، پەنام بە دەرگای ئێوە هێناوە . فەرمووی هەزار بالەشی بدەنێ . وەکیلان عەرزیان کرد لە تەڵەبی خۆی زیاتر ئیسرافە . فەرمووی شیرازیی بێچارە دەنگی کەرەمی ئێمەی بیستووە ، ئەم هەموو چۆڵ‌و بیابانەی پێچاوەتەوە[٢٧] تا هاتووەتە ئێرە ، لە ڕجای خۆی زیاتری دەست نەکەوێ بەشی مەسرەف‌و خەرجیی ئێرەو ڕێگای لێ کەم ئەبێتەوە . ئەمرم کردووە بیدەنێ . (ساعةً) ئەمری ئیجرا کرا .

یەکێکی‌تر : دەروێشێ دە دەواڵی[٢٨] بە دارێکەوە بەست خستیە بەرچاوی قائان‌و عەرزی‌کرد بزنێکم بوو گۆشتەکەم دەرخواردی مناڵان

---

(٢٤) ئەبوو «هیچ شتێ» بوایە .

(٢٥) لە دەسنووسەکەدا وا نووسراوە . بیستوومە لە هەندێ شوێنی موکریان لەباتیی «نامەوێ» ئەڵێن «نام‌هەوێ» .

(٢٦) بۆیا : بۆیە .

(٢٧) ئەم وشەیە وەرگێڕانی «طوی»ی عەرەبی‌یە کە کەوتووەتە فارسی‌یشەوە . لە کوردیدا وەك «تەی‌کردووە» هەیە «پەی کردووە»و «بڕیوە»ش هەیە .

(٢٨) جۆرە دەهۆڵێکی بچکۆلەیە سوار بەسەر ئەسپەوە لێی‌ئەدەن .

دا ، پێستەکەیشم کردووە بە دەواڵ بۆ سیلاحدارانی ئێوە . قائان دەواڵەکانی بە دەستی خۆی گرت . ئەمری فەرموو سەد باڵەشی بدەنێ لە زێڕو هەزار سەر مەڕیشی بدەنێو پێشیوت کە ئەم پارەو مەڕەت تەواوبوو وەرەوە ئەوەندەیترت ئەدەمێ .

یەکێکیتر : قائان عادەتی وابوو سێ مانگەی زستان ڕاوی ئەکرد ، نۆ مانگەکەیتر لە بەردەم خێوەتەکەیا دائەنیشت کۆمەڵ کۆمەڵ لە هەموو مەتاع و جینسێکی لەپێش خۆیا حازر ئەکرد بە ئیسلام و مەغوول و غەیرەی ئەبەخشی . زۆر[29] بە کەسێکی زەلامی بەهێزی ئەگوت هەرچەند ئەتوانی هەڵیگرە بیبەو برۆ . ڕۆژێ لەو پیاوە زەلامانە یەکێ کۆمەڵێکی هەڵگرت وە ڕۆیی ، لە ڕێگا کراسێکی لێ کەوت ، گەڕایەوە بۆ کراسەکە ، قائان فەرمووی مەعنای نییە ئەم پیاوە هەر کراسێك بەرێتەوە . ئەمریکرد کۆمەڵێکیتری بدەنێ بیبا بۆ جێگای خۆی .

یەکێکیتر : ڕۆژێ لە بازاڕی قەرەقروما چاوی بە عەنناب کەوت ، ئارەزووی عەننابی کرد ، کە چووە بارەگا باڵەشێکی دا بە دانشمەند بۆی بدا بە عەنناب ، دانشمەند چووە بازاڕ ، بە چواریەکی باڵەشەکە عەننابی زۆری کڕی ، هێنایە خدمەتی . قائان وتی ئەم هەموو عەننابە بە یەك باڵەش غەدرە . دانشمەند باقیی باڵەشەکەی لە باخەڵ دەرهێنا وتی ئەمە نرخی چواریەکی باڵەشێکە کە داومە بە بەقاڵ . قائان لە دانشمەند عاجز بوو وتی بەقاڵێ لە موددەتی عومریا جارێك یەکێکی وەکوو من بە بەردووکانیا ڕائەبووری ، ئەبێ دوو باڵەشیتری بۆ بەریت .

---

(٢٩) ئەبێ «زۆر جار» بێو لە کاتی نووسینەوەی دەسنووسەکەدا «جار»ەکە لەبیرکرابێ .

یەکێکی تر : ئەمری کرد کە پیاوێك سەد باڵەشی بدەنێ . خەزنەدار وتی قائان وائەزانێ سەد باڵەش سەد درەمە ، سەد باڵەشەکەیان لەسەر ڕێگای قائان لەسەر عەرد ڕاخست ، کە قائان هات وتی ئەمە چی یە ؟ وتیان ئەو باڵەشانەیە کە بۆ فلان دەروێشت حەواڵە کردووە . وتی ئەمە زۆر بێ قەدرو کەمە ، بۆی بکەن بە دووسەد .

یەکێکی تر : پیاوێك لەگەڵ وەکیلانی قائان موعامەلەی هەبوو حوکمی کرد سەد باڵەشی بدەنێ لەباتی ئەو مەتاعەی پێی فرۆشتووین . ڕۆژی دوایی چاوی بە دەروێشێ کەوت لەپێش قەسرەکەیا ڕاوەستابوو ، وای زانی ساحێب مەتاعەکەیە باڵەشەکانی تەسلیم نەبوە ، فەرمووی بۆچ حەقتان تەسلیم نەکردووە ؟ سەد باڵەش بێنن بیدەنێ . دەروێش کە سەد باڵەشی وەرگرت سەرسام بوو ، وتی من هیچم نەفرۆشتووە . من ئەو پیاوە نیم کە موعامەلەی لەگەڵ ئێوە بووە . قائان فەرمووی پارە کە لە خەزنە دەرهات ناچێتەوە ناوی . ڕزقی خۆیەتی بیدەنێ .

یەکێکی تر : ڕۆژێ ژنێ بە بەر قەسرەکەیا ئەڕوا[30] دوو مناڵی بەکۆڵەوە بوو ، قائان چاوی پێ کەوت ئەمری کرد پێنج باڵەش بۆ ئەو ژنە بەرن . خدمەتکارەکە لە پێنج باڵەش یەکێکی دزی ، ژنە فەرقی پێ کرد ، داوای لێ کرد ، خدمەتکار نەیدایێ ، گەڕایەوە . قائان لێی پرسی ئەو ژنە لەگەڵ تۆ قسەی چی بوو کە زۆر قسەتان کرد ، عەرزی کرد کە ساحێبی عەیالە ، بەیانی عائیلەی خۆی ئەکرد ، حوکمی کرد بیگێڕنەوە بچێتە خەزنە

---

(٣٠) ئەبوو «ڕۆیی» بوایە وەك ئەو فیعلانەی پاشەوەی کە عەتف کراونەتە سەری .

هەرچەندیٚ ئەتوانیٚ هەڵیگریٚ ببیا . ژنەکەیان بردە خەزنە ئەوەندەی لە خۆی نا بەقەدەر توجاریٚ دەوڵەمەند بوو .

یەکێکی تر : بازەوانەکەی هات وتی بازەکە نەخۆشە ئەبیٚ گۆشتی بدرێتیٚ . ئەمری فەرموو پارەی گۆشتی بدەنیٚ . کاربەدەستان بەقەدەر لزوومی گۆشت پارەیان دایٚ ، بالەشێکیان نەدایٚ . لەپاشا خۆی پرسیاریکرد کە چیتان بە بازەوان دا ؟ عەرزیانکرد پارەی چەند ڕۆژ گۆشتی بازەکەمان دایٚ ، فەرمووی بازەوان بە بەهانەی گۆشتی بازەکەوە بۆ ئیحسان هاتووە ، بچن پێنج بالەشی بدەنیٚ . ئێمە ئەمەمان ئەویٚ کە خەڵق لە ئیحسانی ئێمە بیٚبەش نەبیٚ .

یەکێکی تر : لە شاری قەرەقروم کەوانسازیٚ ئەبیٚ کەس کەوانی لیٚ ناکرێت ئەوەندە خراپی دروست ئەکرد[٣١] . ڕۆژیٚ کەوانێکی بەسەر دارێکەوە بەست ، لە ڕێگای قائانا ڕاوەستا ، قائان پرسی ئەوە چییە ؟ پیاوەکە وتی من کەوانسازم ، لەناو خەڵقا مەشهوور بووە کەوانی من خراپە ، کەس لێم ناکرێت . لەبەرئەوە زۆر نەداراو فەقیر کەوتووم ، ئەم بیست کەوانەم بۆ خدمەت پادشاە هێناوە . ئەمریکرد کەوانەکانی لیٚوەرگرن ، بە هەر کەوانیٚ بالەشێکی بدەنیٚ .

یەکێکی تر : یەکیٚ لە مولووك کەمەرێکی مورەسسەعی[٣٢] بەدیاری بۆ نارد ، بزمارێکی لیٚ کەوت ، ناردیانە لای وەستایەك بزمارەکەی

(٣١) یا ئەبوو ئەم «ئەکرد»ە «ئەکا» بوایە ، یا «ناکرێت»و «ئەبیٚ»کەی پێشەوەی «نەئەکری»و «بوو» بوونایە .

(٣٢) کەمەر : پشتێن . مورەسسەع : ڕازاوە .

تیٚبخاتەوە . وەستا قومارباز بوو کەمەرەکەی فرۆشت سەرفی ئیحتیاجیی خۆی کرد ، بە «ئەمڕۆ نا ، سبەی» هەر تەفرەی مواشیرەکانی ئەدا ، لە ئاخردا ڕایانکێشا بۆلای قائان ، لەویٚ وتی کەمەرەکەم بۆ ئیحتیاجیی خۆم فرۆشتووە . قائان وتی : ئەمە خیانەتێکی گەورەیە کردووتە ، جەزاشت گەورەیە ، برۆ عەفو بە ، جارێکیتر ئەم حەرەکەتە مەکە . ئەمریکرد سەدوپەنجا بالەشی بدەنیٚ سەرفی ئیحتیاجیی بکا .

یەکێکیتر : پیاوێك پیاڵەیەکی حەڵەبیی بەدیاری بۆ ئەبا . پیاڵەکە ئەبەنە حوزووری . فەرمووی ئەم پیاوە بە زەحمەتێکی زۆر لە حەڵەبەوە ئەم پیاڵەی هێناوە ، دووسەد بالەشی بدەنیٚ . ساحێب پیاڵە کەوتە فکرەوە ئایا ئەم قسەیە ڕاست بیٚ دووسەد بالەشم بدەنیٚ ؟ لەپڕ مژدەیان بۆ هێنا کە وەرە دووسەد بالەش وەربگرە . هەر لەورۆژەدا لە مەجلیسی قائان باسی عەبدی حەبەشی ئەکرا کە بۆ خدمەت زۆر سادق‌و ئازان . فەرمووی لەو پیاوە پرسیار بکەن ئەتوانیٚ عەبدێکمان بۆ بکڕێت بۆمان بێنیٚ ؟ پیاوەکە وتی ئەوە ئیشی منە ، بەسەرچاو ئەم خدمەتە ئەکەم . ئەمریکرد بۆ کڕینی عەبدەکە دووسەد بالەشی بدەنیٚ . کابرای بیٚئینساف پارەکەی وەرگرت‌و ڕۆیی ، ئیتر هەر نەهاتەوە بەو وڵاتەدا .

یەکێکیتر : پیاوێك لە شاخی بزنەکێوی کاسەیێکی دروستکرد بردی خۆی تەقدیمیکرد . قائان گرتی بەدەستیەوە سەیریکرد ، ئەمری فەرموو پەنجا بالەشی بدەنیٚ . ئەمیندار وتی پادشاهم بۆ کاسەیێکی بیٚوجوود ئەم میقدارە ئیسرافە . لێی تووڕە بوو ، وتی نەسیحەتی من مەکەن .

یەکێکی تر : پیاوێك چوار باڵەش لە ئەمیرێك قەرزئەکا ، کە وەعدەی هات پارەی لەدەستا نەبوو بیداتەوە . ئەمیرەکە تەنگەتاوی کرد ، وتی یا پارە یا ئەبێ بێیتە سەر ئایینی بتپەرستی یا بەڕووتی بە بازاڕا بتگێڕن . پیاوەکە سێ ڕۆژ موهڵەتی خواست . لەبەینی ئەو سێ ڕۆژەدا خۆی گەیاندە لای قائان . مەسئەلەیان تێ گەیاند . ئەمری فەرموو ژنو خانوو و ماڵی ئەو ئەمیرە بدەن بە موسوڵمانەکە چونکە ئەم تەکلیفە گرانەی لێ کردووە ، وە بە بازاڕیشا بیگێڕن هەتا جارێکی تر ئەم غەڕڕانە (۳۳) ئەم تەکلیفە نەکەن .

یەکێکی تر : سەییدێکی عەلەویی بوخاراییی لە خەزنە پارەی قەرزکردبوو بۆ کاسبی . کە وەعدەی قەرز هات مەئموران چوونە سەری بۆ پارەکە . وتی تەسلیمم کردووەتەوە . داوای سەنەدی تەسلیمیان کرد ، وتی تەسلیمی نەفسی قائانم کردووە . سەییدیان برد بۆلای قائان ، وتی کێ ئاگای لێ بوو ئەو پارەیەت تەسلیم بە من کردەوە ؟ سەیید وتی کەسمان لەلا نەبوو ، هەر خۆمو خۆت بووین . قائان لە دڵا وتی ئەگەر بڵێم درۆئەکەی ڕەنگە بەعزێ کەس بڵێ ئینکاری وە حاشا ئەکا . وتی سەیید بڕۆ ، ئەمما لەمەودوا نابێ کەس موعامەلەت لەگەڵ بکا . لەپاش چەند ڕۆژێ توجار لە خاریجەوە هاتن قوماشی زۆریان هێنا ، قائان خۆی سەودای لەگەڵ ئەکردن . لەووەختەدا کە دەریای جوودی کەوتبوە شەپۆلدان فەرمووی سەییدی بوخاراییش بانگ کەن . سەیید هات ، فەرمووی سەیید دڵت عاجز بووە کە ئەمرم کرد کەس سەودات لەگەڵ نەکا ، من خۆم سەودات لەگەڵ ئەکەم ، قوماشی تۆش بایی چەندە ؟ وتی سی باڵەش . ئەمری کرد پارەکەیان دایێو قوماشی سەییدیشی کڕی .

---

(۳۳) غەڕڕ : پیاوی دڵپیس .

یەکێکی تر : پیاوێ هەنارێکی بەدیاری بۆ هێنا ، فەرمووی بەقەدەر دەنکی هەنارەکە بالەشی بدەنێ .

یەکێکی تر : موسوڵمانێك پڕ عەرابەیەك[٣٤] میوەی بۆ هێنا بەئومێدی ئەوە ئیزنی بدا بۆ مەملەکەتی خۆی . ئەمری کرد ئیزن بیٚو بالەشێکیشی بدەنێ .

یەکێکی تر : دزێ ئینتیزاری ڕۆژی سەیران‌و شاییی قائانی ئەکرد کە شتێ بدزێ . کە نۆبەتی ئەورۆژە هات خەزنەوان هەموو سەرخۆش کەوتن ، پیاڵەیەکی زێڕی لە خەزنە دزی‌و بردی . ڕۆژی دوایی بۆ پیاڵەکە گەڕان دیارنەبوو ، قائان خەبەری زانی فەرمووی جاربدەن هەرکەس پیاڵەکە بێنێتەوە لە ڕۆحی خۆی ئەمین بیٚو تەڵەبیشی قوبووڵە . دزەکە پیاڵەی بردەوە . لیٚیان پرسی لەم بردن‌و هێنانەوەت مەقسەد چبوو؟ دزە وتی مەقسوودم ئەوەبوو کە پادشا ئیعتماد بە نۆبەتچی نەکا . ئەگەر مەتڵەبم دزی بوایە شتی بەقیمەتتر لە پیاڵەکە زۆر بوو . ئومەرا وتیان لازمە ئەم پیاوە سیاسەت بکرێ[٣٥] تا کەسێکی تر ئەم جەسارەتە نەکا ، قائان وتی ڕۆحی ئەم پیاوە ئەمینە ، حەیفە پیاوی‌وا بەجەسارەت بکوژرێ . ئەمری‌کرد پێنجسەد بالەش‌و چەند ئەسپی ڕەهوان‌و خەڵاتی بەقیمەتی بدرێتێ وە لە مەمەلەکەتی خەتا حاکمی چەند هەزار خانە بیٚ .

یەکێکی تر : لە ویلایەتی قەراقروم لە وەقتی پێگەیشتنی گەنم‌و جۆ تەرزەییێکی‌وا باری زەراعەت هەمووی مەحوبووەوە . قائان ئەمری‌کرد

---

(٣٤) عەرڕابە : عەرەبانە .

(٣٥) واتە : لە سزادا ڕسوا بکرێ .

دڵیان تەنگ نەبێ هەرچی زایعاتێ بووە لە عەماری حوکوومەت ئەیاندەمەوە ، ئەمما جارێکی‌تر مەزرووعات ئاوبدەن بەڵکو شتێکی لێ پەیدا بێ . زاریعەکان بەقسەی ئەویان کرد ، زەراعەتیان ئاودا . ئەوساڵە چواریەکی زیاد لە ساڵان گەنم‌و جۆ هاتە پێشەوە .

ئەم پادشای مەغوولە بێجگە لە سەخاو کەرەمی ، زۆر ئەخلاقی گوزیدەی بووەو بەرابەر بەوانە سیاسەت‌و حوکمیشی نواندووە . لازمە سەردەفتەری (گەنجینەی مەردان) ئۆکتای قائان بێ . خوا لە قیامەتیشا جەزای ئیحساناتی بداتەوە .

# خواجه نیزامولمولك ئەبووعەلی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئیسحاق

نیزامولمولك کوڕی عەلیی تووسی بوو ، لە دیوانا کرێکار[1] بوو . لەبەر سەخاوەتی بەراتەکەی بەشی نەدەکرد . خوا ئەم کوڕەی دایێ ، چاوی پێ ڕووناك بوو . هەموو هیممەتی بۆ تەربی یەی سەرف کرد . لە یازدە ساڵیدا قورئانی خوێند . بە دەرس خوێندن لای مامۆستایان دەوامی کرد ، بە تەحسیلی عیلمەوە مەشغووڵ بوو . لە شەرعی شافیعیدا سەرکەوت . ئینجا ڕووی کردە غوربەت ، لە نووسینیشدا مەهارەتی پەیدا کرد ، لە ئەووەڵەوە بە کاتبی عەمیدی بەلخی دامەزرا . عەمید چونکە قسەی ناخۆش و بێ مەعنا بوو و تەبیعەتی خەسیس ، لای ئەو فیراری کرد چووە (مەرو) ، بە واسیتە گەیشتە حوزووری چوغوربەگی سەلجووقی ، ئەحواڵی خۆی بۆ گێڕایەوە .

---

(١) وشەی (کرێکار) لێرەدا وەرگێڕانی (عامیل)ی عەرەبی یە ، بەڵام (عامیل) لە زاراوەی مێژوویی دەوڵەتە موسوڵمانەکانی کۆندا واتە (والی) یا جێ نشینی خەلیفە . مەبەستی زێوەر ئەوەیە عەلیی تووسیی باوکی نیزامولمولك لە دیوانا عامیل بووە ، نەك نیزامولمولك خۆی .

چوغووربەگ کە تەماشای قسەکردنو ئەدەبو تەربی یەی کرد عەلامەتی ئیقبالی لیٚ موشاهەدە کرد ؛ ناردی بۆ لای ئالبئەرسەلانی کوڕی وە بۆشی نووسی ئەم زاتە ئەبیٚ کاتبو موشیرو تەدبیرکەرت بیٚ . لەووەقتەدا عەمید ئیبنیشادان عەریزەی بۆ چوقوربەگ[٢] هات کە ڕجائەکەم نیزامولملکم بۆ بنیٚرەوە . چوقوربەگ نووسی یەوە لەلای ئەلبئەرسەلانە ، کاغەز بۆ ئەو بنووسن . پیاوەکانی عەمید بە مەئیووسی گەڕانەوە . کە نۆبەتی پادشاهیو حوکمداری کەوتە دەست ئەلبئەرسەلان ئەویش هەرچی ئیشو کاری خۆیو عالەم هەبوو حەواڵەی فکری خواجەی کردو کردی بە وەزیر .

خواجە نەوشیروان خالید لە کتیٚبی (نقشة الصدور)دا نووسیویە کە خۆم لە نەفسی موبارەکی خواجەم بیستووە فەرمووی لە ئیبتیدای حالٚ لەسەر کاریٚ کە بەیانی فائیدەی تیا نی یە ، مواشیران لە جیٚگایەك منیانئەبرد[٣] بۆ جیٚگایەکی تر . سواری ئەسپیٚکی بەدڕەفتار کرابووم ، لە پەریٚشانیو بیٚتەدارەکی ڕۆژم لەلا شەوی تاریك بوو ، بە غەمو خەفەتیٚکی زۆرەوە بیابانم لەگەڵ ئەبڕین . لەناکاو لەو دەشتو بیابانەدا سواریٚ پەیدابوو نە من ئەمناسی وە نە مواشیرەکان . سواری ئەسپیٚکی قەڵەوی ڕەهوان بووبوو بە منی وت[٤] ئەتەویٚ ئەسپەکەمان بگۆڕینەوە ؟ وتم ئەی جوان

(٢) لیٚرەدا (چوقوربەگ)ەو پیٚشان (چوغوربەگ) بوو . لە میٚژووە عەرەبیو فارسی یەکانا بە (طوغرول بەگ) ناوی هاتووە . ئەم وشە تورکی یانە کە ئەهیٚنریٚنە کوردیو فارسیو عەرەبی یەوە ئەم وردە گۆڕانانەیان بەسەرا دیٚ .

(٣) ڕستەیوا نیشانەی وەرگیٚڕانی حەرفی یە ، ئەگینا ئەبوو بووترایە «لە جیٚگایەکەوە ئەیانبردم . .» .

(٤) ئەبوو «پیٚی وتم» بووایە .

چ‌وەقتی[٥] گاڵتە پێ کردنە ! وتی وەڵلا گاڵتە ناکەم . گورج دابەزی منی سواری ئەو ئەسپەکردو خۆیشی سواری ئەسپەکەی من بوو . لە ئێمە تێپەڕیو ڕۆیشت . لەم حاڵە منو سوارەکان عەجایبمان لێ هات . ئەمەم بە فاڵی[٦] چاك خەیاڵ کرد . سی ساڵە حوکومەت ئەکەم ، لەشوێن ئەو جوانە ئەگەڕێم ، سەرو سۆراخی نی‌یە . مەعلووم بوو لە (رجال الغیب) بووە خوا ناردوویەتی بۆ من[٧] .

سەدیدوددین موحەممەدی بوخارایی ئەگێڕێتەوە کە نیزامولمولك لە هەرات ، لە بەغدا ، لە بەسرە ، لە ئەسفەهان ، لە عێراقی عەرەب ، لە شارانی ڕۆم ، لە هەموویانا ئاساری خێرو ئیحسانی بووە . یەکێ لەوان مەدرەسەی نیزامی‌یەیە لە بەغدا . ئەویش مەدرەسەیەك بوو هەرکەس تەحسیلی تیا کردووە لە ئەنواعی عولوومو فونوون بەهرەدار بووە . مودەڕڕیسیان لە فوحوولی عولەما وەك ئیمام ئەبوو ئیسحاقی شیرازیو حوججەتولئیسلام ئیمامی غەزالی بووە ڕەحمەتیان لێ بێ .

ئەگێڕنەوە کە لە مەدرەسەی نیزامی‌یە فەراغەتیان بوو و تەواوکرا[٨] ، وەزیفەی کوتوبخانەی تەسلیمی شێخ ئەبووزەکەریا خەتیبی تەبریزی کرد . ئەویش هەموو شەو شەرابی ئەخواردەوە . بەووابی[٩] مەدرەسە ئەم

---

(٥) چ‌وەقتی : کەی وەختی .

(٦) فاڵ : فأل ، نیشانە ، گەش‌بینی .

(٧) ئەبوو ئەم ڕستە بەم‌جۆرە بووایە : «مەعلووم لە (رجال الغیب) بوو خوا ناردبووی بۆ من» .

(٨) واتە : کە لە دروست‌کردنی بوونەوە .

(٩) بەوواب : بواب ، دەرگاوان .

خەبەرەی عەرزی خواجە کرد ، فەرمووی بە چاوی خۆم ببینم باوەڕ ناکەم . لەئاخردا لەدڵیا بووە وەسوەسەو غائیلە . شەوێك هەستا چوو بۆ مەدرەسە ، لەسەر بانی کوتوبخانەوە تەماشای‌کرد قسەی بەوواب ڕاست بوو شێخ شەراب ئەخواتەوە ، گورج گەڕایەوە دەنگی نەکرد . کە ڕۆژ بووەوە ئەمری‌کرد دەفتەری وەقفی‌یەیان بۆ هێنا ، لە دەفتەردا وەزیفەی ئەبووزەکەریای قاتیٚ زیادکردو فەرمانیشی بۆ نووسی بە یەکیٚ لە نائیبانی خۆی[10] ناردی بۆ شێخ ، فەرمووی ئەم فەرمانە بەرە بۆ شێخو عەرزی بکە فلاٚن سەلامت لیٚ ئەکاو عەرزت‌ئەکا لە ئەووەڵەوە من نەمزانی کە مەسرەفی زیادی هەیە ، وەئیللا لە وەقتی تەعیین‌کردنیا بەم میقدارە وەزیفەیە کە لە شەرتی واقیف بە ناوی شێخەوە نووسراوە — ڕازی نەدەبووم . کە فروستادە چاوی بە شێخ کەوت‌و قسەی نیزامودەینی بۆ گێڕایەوە مەعلوومی بوو کە خواجە بە ئەحواڵی ئەو شارەزا بووە . پەشیمانی‌و خەجاڵەتی ڕووی تیٚ‌کرد . دەستی بۆ داوێنی تەوبە درێژکرد ، ئیتر هەتا لە دنیا مابوو نزیکی بیٚ‌شەرعی‌و شەراب‌خواردنەوە نەکەوت .

ئەگێڕنەوە موعتەمەدێکی خواجە کە مەشهوور بوو بە ئەبی‌سەعد ئەحمەد کوڕی موحەممەدی نەیشاپووری ، کردبووی بە سەرکاری عیمارەتی[11] مەدرەسەی نیزامی‌یە . کە مەدرەسە تەواوبوو خەبەریان بە خواجە دا کە ئەبی‌سەعد لە عیمارەتی مەدرەسەکە خەیانەتێکی زۆری کردووە . ئەبووسەعد خەبەری زانی ، ڕای‌کرد بۆ بەسرە . ئاخری لە

---

(١٠) ئەبوو «خۆیا» بووایە .

(١١) واتە : بیناکردنی .

فیراری پەشیمان بووەوە ، هاتەوە بەغدا ، چووە حوزووری خواجە وتی ئەی گەورەم تۆ ئەم مەدرەسەیەت (خالصا لوجه الله) دروست کردووە ، هەرکەس خەیانەتی تیا کردبێ حەواڵەی خوای بکە هەتا تۆ سەوابی خۆت دەست بکەوێ ، خاین ئۆباڵی خۆی ببا بۆ قیامەت . لە جوابا فەرمووی ئەی ئەحمەد ئەندێشەی من بۆ ماڵی دنیاو نەقد نی یە کە تۆ بردووتە ، بەڵکو غەمی من بۆ ئەوەیە کە زەمانی لەکیس چوو ناگەڕێتەوە . من ئەمویست کە بینای ئەم مەدرەسەیە وا مەحکەم بێ بە مورووری زەمان کەلەبەری تێنەکەوێ . ئەوی ڕۆی تازە بەسەر ناگیرێتەوە . زەمان ناگەڕێتەوە . لەم قسەیە زیاتر بەو خاینەی[١٢] نەوت .

وە خدمەتێکی تری مەدرەسەی نیزامولمولك مەدرەسەی بەسرە بوو کە لە ویسعەتو گەورەییدا لە مەدرەسەی بەغدا زیاتر بوو ، لە زاهیری بەسرە[١٣] نزیك بە قەبری زوبەیری عەووام تەرتیب کرابوو ، لە ئاخری زەمانی ئەلموستەعسیمو بیللاە ئەو مەدرەسەیە وێران بوو . عەوام[١٤] ئالاتو ئەسبابو تەداروکاتی ئەو مەدرەسەیان نەقڵ کرد بۆ شار .

زاتێ لە فازیلان ئەگێڕێتەوە لە زەمانی سوڵتان مەلیكشاە خواجە ئیرادەی حەجی کرد . ئیزنی لە سوڵتان خواست ، ئیزنی دا . خواجە ئەمری کرد بارو بارخانەیان کێشایە غەربی بەغدا ، چەند ڕۆژێ لەوێ خێوەتو بارەگای لێ هەڵدا . منیش ڕۆژێ چووم بۆ خدمەتی ، کە نزیك خێوەت بوومەوە چاوم بە یەکێ کەوت عەلامەتی ساڵحانو چاکان لە شکڵیا

---

(١٢) وا ڕەساتر بوو بڵێ : «لەم قسەیە زیاتری بەو خاینە نەوت» .

(١٣) واتە : لە دەرەوەی شار .

(١٤) عەوام : عامة الناس ، ڕەشەخەڵك .

ئاشکرا بوو . ئەو زاتە کاغەزێکی دایە دەستم ، وتی ئەمە ئەمانەتی وەزیرە تەقدیمی بکە . کاغەزەکەم لیٚ وەرگرت ، چوومە ناو خێوەتەکە ، نەمخوێندەوە ، تەسلیمی وەزیرم کردو چۆنیەتیی حاڵم بۆ گێڕایەوە . خواجە کە کاغەزی خوێندەوە دەستی‌کرد بە گریان . ئەوەندە بەکوڵ گریا من لە کردەی خۆم پەشیمان بوومەوە . لە دڵا وتم کاشکی ئەم کاغەزەم تەسلیم نەکردایە . کە لە گریان بووەوە وتی ساحێبی ئەم کاغەزەم بۆ بێنە ، چووم زۆر گەڕام چاوم بەو پیاوە نەکەوتەوە . ناچار گەڕامەوە خەبەرم‌دایێ . خواجە کاغەزەکەی لە بەردەمی دانا . کە خوێندمەوە نووسیبووی حەزرەتی پێغەمبەرم لە خەودا دی فەرمووی بچۆرە لای حەسەن پێی‌بڵێ حەجی تۆ لێرەیە ، بۆچ ئەچیتە مەککە . من پێم‌نەوتی لە دەرگای ئەم تورکە جویٚمەبەرەوە ، ئیشی ساحێبانی ئیحتیاجی لە ئوممەتی من دروست بکە ، بە هاواری داماوانا بگە . ئیتر خواجە خەیاڵی حەجی تێکدا . بە منی وت هەروەقتیٚ ساحێبی ئەم کاغەزەت چاو پیٚ کەوت بۆم بێنە . لەپاش مووددەتیٚ تووشی بووم ، پێم‌وت وەزیر موشتاقی مولاقاتی تۆیە ، ئەگەر ئەم ئەزیەتە بکێشی زۆر لوتف‌و کەرەمە . لە جوابا وتی وەزیر ئەمانەتی‌یەکەی[15] لای من بوو تەسلیمی کرا ، ئیتر من کارم بەو نی‌یە ، ئەویش بە من .

لە بەعزیٚ تەئریخدا نووسراوە کە نۆبەتی یەکەم سوڵتان مەلیك‌شاه چووە بەغدا فەقیران‌و موحتاجان‌و عالمان لە دەرگای خواجە نیزاموددین کۆبوونەوە ، ئەویش ڕەحمەتی لیٚ بیٚ‌کەسی بیٚ‌بەش نەکرد . کە گەڕانەوە حیسابیان کرد سەدوچل هەزار دیناری سەرف کردبوو .

---

(١٥) ئەبوو «ئەمانەتی‌یەکی» بووایە .

خواجه نیزامولمولك زاتێکی پاكعەقیدە ، دڵنەرم ، غەمی قیامەتی لە دنیا زیاتر بوو . ئەگێڕنەوە کە سوڵتان مەلیکشاە لە ئەسفەهان مەدرەسەیێکی دروستکرد ، لە وەقتی نووسینی وەقفنامە لە سوڵتانیان پرسی چ تائیفەیێك لەم خێراتە ئیستیفادە ئەکا ؟ جوابی دایەوە کە ئەم بینایە بۆ ڕەزای ئیلاهی کراوە ، تائیفەیێك بەهرەی لێ بگرێ‌و تائیفەیێك مەحرووم بێ هیچ مەعنای نی‌یە . بنووسن کە ساحیبانی هەردوو مەزهەب حەنەفی وە شافیعی بەموساوات لە ئەوقافی ئەم مەدرەسەیە نەفع ببینن . لەپاشا لەسەر ڕیعایەتی موڵك[١٦] ئیرادەیانکرد ناوی شافیعی پێش بخەن . خواجە مەنعی‌کرد ، ڕەزای نەبوو . موددەتێ نووسینی وەقفنامە موعەتتەل مایەوە . لەئاخردا وایان نووسی : «وقف على الامامين امامي الأئمة وصدر الاسلام» .

شەخسێ ئەگێڕێتەوە کە لە مەجلیسی خواجە نیزامولمولکدا بووم کاغەزێکی لە عێراقی عەجەمەوە بۆ هات کە ئەسپانی عەرەبی لەبەینی دوو کێودا ئەلەوەڕان . لەووەقتەدا چەند تەیری گەورەی وەك داڵ‌و هەڵۆ بەسەر ئەسپەکانا فڕین . لە دەنگی باڵی ئەو تەیرانە ئەسپەکان ڕەویانکرد کەوتنە دەربەندێکی تەنگ لەبەینی دوو شاخاو جێگایەکی بەرز ، ئاوێکی زۆر لە داوێنی ئەو شاخە ئەڕۆیی . نەهرێکی گەورە بوو ، ئەسپەکان لە یەکتر ئەکەوتن . سەرەوژێر ئەکەوتنە خوارەوە بەعزێکی ئاو بردی ، بەعزێکی دەست‌و ڕانیان شکا . عەددەدی ئەسپی زایع بوو گەیشتۆتە پێنجسەد

(١٦) لە دەسنووسەکەدا بەمجۆرە نووسراوە : «ملك» . دڵنیا نەبووم «مەلیك»ە‌و مەبەستی مەلکیشایە کە مەدرەسەکەی دروستکردووە یا «موڵك»ە بەمەعنا (حوکوومەت) . هەرچۆن بێ من وام لا پەسەند بوو بە (مۆڵك)ی بخوێنمەوە ، چونکە هەردوو مەعنا کە ئەگرێتەوە .

ئەسپ . کە خواجە کاغەزەکەی خوێندەوە نەختێ بێ‌دەنگ بوو . لەپاشا دەستیکرد بە گریان ، گریانێ کە هەموو مەجلیس عەجاییبیان لێ هات کە وەزیر شەرق‌و غەربی دنیای بەدەستەوەیە ، بۆ ئەم زیانە کەوتۆتە گریان‌و ئیزتیراب . ئەهلی مەجلیس زوبانی دڵخۆشیدانەوەیان کردەوە ، بۆ تەسەللای خاتری قسەیانکرد . خواجە سەری ڕاستکردەوە ، وتی گریانی من بۆ تەلەفی ئەسپەکان نی‌یە ، ئەگەر سەد ئەوەندە زەرەرو زیانم تووش بێ نابێتە سەبەبی پەرێشانیی من . ئەمما لەموەقتەدا ئێشێکم هاتەوە بیر کە بووە واسیتەی ئەم هەموو گریانە . ئەویش ئەوەیە جارێك لە غەزنەینەوە قەسدی خۆراسانم کرد لە سێ دینار زێڕ زیاتر هیچم شك‌نەدەبرد . چوار دیناریشم قەرزکرد . بەو حەوت دینارە ئەسپێکم کڕی . هەر لەوڕۆژەدا ئەسپەکەم تۆپی . منیش زۆر عاجز بووم ، ئێستا هاتەوە یادم کە بە مردنی ئەسپێك کە نرخی حەوت دینار بوو ئەو هەموو مەلووڵی‌و عاجزی‌یە سوارم‌بوو . ئەمڕۆ کە بیستم پێنج‌سەد ئەسپ بەجارێ تەلەف بووە ، لە فەزڵی ئیلاهی‌یەوە بەقەدەر سەری مووێ تەغییرو تەبدیل بە دڵی منا نەهاتووە . لە زۆریی فەرەح‌و شادی گریان بەسەرما هات .

**الحمد لخالق البرايا**

**والشكر لواهب العطايا**

شاعیرێ لە مەدحیا ئەم شیعرەی وتووە[17] :

**هەر وەزیرو موفتی‌یو شاعیر کەوا تووسی ئەبێ**

**وەك نیزامولمولك‌و غەززالی‌یو فیردەوسی ئەبێ**

غەرقی بەحری ڕەحمەتی یەزدان بێ .

---

(١٧) ڕەنگ‌بێ مەبەستی زێوەر لەو شاعیرە خۆی بێ ، یا هەر هیچ نەبێ شیعرێکی عەرەبی یا فارسی بووە خۆی بە شیعر کردوویە بە کوردی .

# بوداق سوڵتان

بوداق سوڵتان کوڕی شێرخان کوڕی شێخ حەیدەر لە حوکمدارانی موکریان ، پادشاهێکی[1] لە تەئریخی هەفدەهەمی هەزاری دووەمدا بووە . نیشانەی چاکەی ، زۆر دامەزراوی لەپاش خۆی بەجێ ھێشتووە : دروستکردنی شاری سابڵاخو ، کارێزێ کە ئێستا بە (کانی سارد) ناوبانگی کردووەو[2] ، پردی سابڵاخ کە بۆ تەئریخی (هدانا الله صراطا مستقیما) دانراوە ئەکاتە[3] هەزارو هەفتاونۆی هیجری[4] ، مزگەوتی جامیع و مەدرەسەی سوور کە لە ساڵی هەزارو هەشتاونۆ[5] دروست کراوە[6] ئەوقافی زۆری بۆ مەعلووم کردووەو ، کوتوبخانەیەك کە پڕ بوو[7] لە هەموو نەوعە کتێبو قورئانی مەجیدو کتێبانی حەدیثو عولوومی فیقهی یەو نەقلی یەو عەقلی یەو ئەوقافی عیبارەت بوو[8] لەدێی (باغلووجە)و

---

(١) ئەبوو «پادشاهێکە» بووایە .

(٢) ئەبوو «دەرکردووە» بووایە .

(٣) ئەبوو «کە ئەکاتە» بووایە .

(٤) ئەکاتە ١٦٦٨ – ١٦٦٩ی عیسایی .

(٥) ئەکاتە ١٦٧٨ – ١٦٧٩ی عیسایی .

(٦) ئەبوو «کراوەو» بووایە .

(٧ ، ٨) ئەبوو «بووە» بووایە .

(کارێزە) وە (لەکز) وە دوو حیسسەی (شاری‌کەند)و تەواوی دێی (ئالی‌کەند)و لەناو شاری سابلاخدا کاروان‌سەراو حەمام کە ئێستا رووخاون . خولاسە ئەم پادشای کوردە لە حوکوومەتیشدا رەعی‌یەت‌پەروەر ، عەدالەت راخەر ، بە مەردی‌و هونەر لە دنیادا رایبواردووە . شەست‌وسێ ساڵ لە خدمەت‌کردنی میللەت‌و ئیتاعەتی خودا سستیی نەبوە .

وە لە نەوەی ئەو کە بە ناوی ئەوەوە ناونراوە بوداق‌خان مەردێکی‌وا بووە لە دینداریدا وەکو باپیری خۆی بوداق سوڵتان بووە . تەریقەی نەقشبەندیی لە خدمەت خواجە عەبدولخالقی غەجدەوانی وەرگرتووەو دائیما لە خدمەت عالمان‌و ساڵحان وەقتی رابواردووە . هەمووکەس لە دەریای ئیحسان‌و خوانچەی پڕ خوانیدا تێر بووە . لە دادگوستەری‌و عەدالەتخواهی‌و ئەوقاف‌و خێراتێ کە بوداق سوڵتان دایناوبوون وە وێران‌کرابوون هەمووی ئاوا کردەوە .

بوداق‌خان کوڕی شێخ عەلی‌خان بووە . لە زەمانی حوکوومەتی ، جووتیاران وە خاوەن‌کرداران بە رەفاهی‌یەت خەریکی چاندن‌و کێڵانی خۆیان بوون . دوعایان بۆ دەوامی عومرو ئیقباڵی ئەکرد . فەرشی ئاسوودەگی‌و دڵنیایی‌و خۆشی‌و هەرزانی ، بەسەر هەموو وڵاتی موکری‌و سەردەشتدا رایخستووە[٩] .

لە ئامۆزایانی خۆی ئیمام قولی‌خان ئەچێتە لای شای ئێران کەریم‌خانی زەند ئەمرو فەرمانی حاکمیەتی موکریان وەرئەگرێ ، بە لەشکرێکی

(٩) ئەبوو «راخستووە» بووایەو ئەو (ی)ی ضەمیرە بکەوتایەتە سەر وشەی (هەرزانی) کە لەپێشەوە رابوورد .

زۆرەوە دێت بۆسەر بوداق‌خان . ئەمیش ئەم خەبەرەی بیست[١٠] ، تەرتیبی لەشکری کرد ، بەعەجەلە بەتاو شەبیخوونی کرد بۆسەر لەشکرەکەی ئیمام قولی‌خان . کە ئەگەنە سەریان پەلاماری لەشکرەکە ئەدەن ، ئەبێ بە جەنگی خوێنرێژانە . ئیمام قولی‌خان ئەکوژرێ . لەشکرەکەی پەرێشان ئەبێ . لە کوشتنی ئامۆزای زۆر گریاو عاجز بوو[١١] . جەنازەکەی بردەوە پایتەخت سابلاّخ لەوێ ناشتیان . خێرو ئیحسانێکی زۆری بۆ کرد .

بوداق‌خان مەردی دین‌و دنیا بووە . ئەهالی هەر دوعای دەوامی عومرو ئیقباڵیان ئەکرد[١٢] . شەجاعەتیشی وەك دیانەت‌و سەخاوەتی ئاشکرا بوو . (ان شاء الله) جێگای بەهەشتە . غەرقی مەرحەمەتی خودایی بێ .

**«لە غەزەتەی «دەنگی گیتی‌ی تازە» وەرگیراوە[١٣]»** .

---

(١٠) ئەبوو «کە ئەم خەبەرەی بیست» بووایە .

(١١) واتە : بوداق‌خان .

(١٢) ئەبوو «بۆ کردووە» بوایە .

(١٣) لە هەموو ئەو ژمارانەی گۆڤاری (دەنگی گیتی‌ی تازە)دا کە لە بەردەستما بوون ، ئەم وتارەم نەدۆزی‌یەوە تا بزانم (زێوەر) خۆی نووسیویەو لەو گۆڤارەدا بلاّوی کردووەتەوە ، یا هەر لێی وەرگرتووەو ، ئاخۆ دەق لێی وەرگرتووە یا بە دەسکاری‌یەوە .

# سوڵتان عەبدولحەمید خان

لە پادشاهانی عوسمانی سوڵتان عەبدولحەمید خان پادشاهێ بوو ساحێب حوکمو عەداڵەتو عەقڵو دیرایەتو مورووەت ، بە ئیحسانو نیعمەت . لە قەڵەمڕەوی ئەوا هیچ شارێ نەبوو بەڵکو قەزاو ناحیەیەك کە ئاساری چاکەی ئەوی تیا نەبێ یا مزگەوت یا منارە یا پرد . لە نەفسی سولەیمانی‌یا منارەی مزگەوتی گەورەو خانەقای مەحوی لە ئاساری دین‌پەروەریی ئەم پادشاهەیە . لە هەموو ولاٚتێکا میقدارێ لە ئەرازیی بۆ خۆی جوێ کردبوەوەو تاپۆشی کردبوو ، ناوی نابوو « ئەرازیی سەنییە» ، واردیداتی ئەم ئەرازی‌یانە سەرفی خێراتو عولەماو ساداتو موسافیرخانەی ئەستەنبووڵی ئەکرد . زۆر موحیببی ئەهلی سەلاحو عیبادەت بوو . شوعەراو عولەما لە قەسایدا ، لە دێباچەی تەئلیفاتیان وەسفو مەدحیان زۆر نووسیوە . شاری ئەستەنبووڵ بە واسیتەی کەرەمو ئیحسانی شاهانە دائیما لە مەغریبی ، لە میسری ، لە هیندی ، لە ئەفغانی ، لە تورکستانی ، لە کورد ، لە عەرەب ، خاڵی نەبوو . هەرکەس بە ئومێدێ ، بە تەمەعێ ڕوویان تێ ئەکرد . هەرکەس بە حوزووری خۆی بگەیشتایە یا عەریزەی تەقدیم بوایە بێ‌سوودو بێ‌بەهرە نەدەبوو ، یا بە مەعاش یا بە ئینعام یا بە وەزیفەیەك بۆ ولاٚتی خۆی ڕەوانە ئەکرایەوە .

پادشاهی‌وا بەکەرەم‌و بەخشش‌و عاقڵ‌و سیاسەت‌زان کەم بووە ، ئەمما زەمانەکەی یاریەی نەدەدا لەوە زیاتر خدمەت بە میللەتی بکا . بە واسیتەی رەقابەتی حوکوومەتەکانی ئەورووپا دەستی بەسترابوو . ئەوانیش نەیان‌ئەتوانی بچن بەگژیا ، ئەمیش بە سیاسەت دڵی ڕاگرتبوون . من حەقی ئەم قسەیەم نی‌یە ، ئەوە حەقی تەئریخە . من هەر ئەحواڵی خوسووسیی خۆی ئەنووسم کە بیستوومەو چاوم پێی کەوتووە .

سوڵتان سەبەب بە ئیخلاسێ کە دەرحەق ساداتو مەشایخی هەبوو ، دەرحەق بە حەزرەتی کاك‌ئەحمەد زیاتر بوو ، وە کاك‌ئەحمەدیش لەبەر ئیختیاری توانای سواری‌و سەفەری نەمابوو ، ئەو ئارەزووەی هەر لە دڵا بوو . حەزرەتی کاك‌ئەحمەد کە بۆ خدمەتی ئایندەو ڕەوندەو مریدانی تەنها واریداتی ئاشێکی بوو لە سەیداوا ، کچەزای خۆی شێخ موحەممەدی شێخ عەلیی نارد بۆ خدمەتی سوڵتان‌و کاغەزیشی بۆ نووسی . شێخ موحەممەد کە ئەگاتە ئەستەنبووڵ ، پادشاه لە موسافیرخانە قوبووڵی ئەکا ، ئیلتیفات‌و مەرحەمەتی لەگەڵ ئەنوێنێ ، فەرمانی زەکاتی پێنج دێ وەك نۆدێ ، عازەبان ، بزەینی‌یان ، وێڵەدەر ، خەراجیانی بۆ ئەنووسێ کە وەقفی دەرگای کاك‌ئەحمەد بێ بۆ مەسرەفی میوان‌و مریدانی‌و ، بۆ شێخ موحەممەدیش مەعاشی تەخسیس‌کرد . فەرمان‌و ئەمری شاهانەی بۆ حوکوومەتی سولەیمانی هێنایەوە کە ئیتر موداخەلەی زەکاتی ئەو دێهاتە نەکەن ، ڕاجیع بە تەکیەی کاك‌ئەحمەدە . سوڵتان بەوە قەناعەتی نەبوو ، ئیرادەی‌کرد کە حەفیدو وەلیعەهدی کاك‌ئەحمەد شێخ سەعید بچێتە ئەستەنبووڵ بۆ حوزووری شاهانە ، ئەویش لەسەر ئەو ئەمرە تەشریفی چوو وە نائیلی ئینعام‌و ئیلتیفاتی پادشاهی بوو .

لەپاش چەند ساڵێکی تر دووبارە ئەمری کرد کە شێخ سەعید بچێتەوە بۆ خدمەت زاتی شاهانە . مەرحووم شێخ تەدارەکی سەفەری ڕێکخست ، لە خزمان و ئەشراف و عولەماو خدمەتکار نەزدیکی چل کەسی ئینتیخاب کرد کە لەو سەفەرە لەخدمەتیا بن . لە ئەقاریب شێخ موستەفاو شێخ عومەری برای و شێخ مەحموودی کوڕی ، باقی لە ئەشراف و موعتەبەران و عولەما بوون . بەواسیتەی جەنابی شێخ مەحموود کە مەرحەمەت و ئیلتیفاتی لەگەڵ من هەبوو ، منیش داخلی هەیئەتی سەفەری یە بووم . ئیرادەی شاهانە سادربوو کە هەموو مەساریفی ڕێگای شێخ و تەبەعەی هەتا ئەستەنبووڵ لەسەر حوکوومەت بێ .

شێخ حەرەکەتی فەرموو ، هەتا گەیشتە مووسڵ ، موددەتێك لە مووسلاً مایەوە ، لەپاشا چووینە دیاربەکر ، شێخ تەشریفی بەتەنها لای والی میوان بوو ، باقی لە ماڵی نەقیبی دیاربەکر میوان بووین ، خدمەت و حورمەتی زۆریان گرتین ، لە دیاربەکرەوە شاربەشار بە قەدرو حورمەتەوە ڕۆیشتین هەتا داخلی ئەستەنبووڵ بووین ، تەشریفی شێخ و براکانی و ئەشراف لە ماڵی سەیید ئیبراهیم ئەفەندی وەکیلی فەراشەتی[1] شەریفە میوان کران . ئەوی مایەوە چووینە موسافیرخانەی (نیشان داش) . ئەسبابی

---

(١) وەکیلی فەراشەت : فەراشەت لە دەوڵەتی عوسمانیدا بریتی بووە لە خزمەتکردنی شوێنە پیرۆزەکانی مەککەو مەدینەو لە هەموو شارێکیش وەکیلی فەراشەت جێنشینێکی بووە بەرەبووی ئەوقافی ئەو شوێنە پیرۆزانەی کۆکردوەتەوەو ناردوویە بۆ مەککەو مەدینە . لەبەر پیرۆزیی ئەم ئەرکە سوڵتان خۆی (فەڕڕاش)ی گەورە بووەو ئەوەی لە مەککەو مەدینە ئەرکەکەی جێبەجێ کردووە جێنشینی ئەوو . ئەوانی شارەکانیش وەکیلی ئەم بوون .

ڕاحەتی لە هەموو خوسووسێکەوە لە موسافیرخانە مەوجوود بوو . ئەهلی شارو کوردان یەکەیەکە بۆ زیارەتی شێخ ئەهاتن‌و ئەربابی ئیحتیاج لە کوردو غەیرە موراجەعەتیان بە شێخ ئەکرد کە ئیشیان دروست‌بێ . ئەویش بۆ کەس قوسووری نەدەکرد .

ڕۆژێ دانیشتبووین تەماشامان‌کرد (حافظ القرآن)ێ یەکێ دەستی ڕائەکێشێ ، هات بۆ خدمەت شێخ ، موسافەحەو دەست‌بۆسیی لە خدمەت شێخا کرد . مەگەر ئەم زاتە مەلاعوسمانی حافزی مەشهووری مووسڵی بوو ، بە شێخی وت «یاسیدی ما جئتك لانعامك ولا لأخذ راتب أو وسام بواسطتك من السلطان . جئتك زائرا حبا لجدك محمد عليه الصلاة ، وقلت فيك اشعارا مرتجلا في هذا الطريق ، وفيها التأريخ» . شێخ قسەکانی زۆر پێ خۆش‌بوو ، بەعەرەبی بەخێرهاتنی کرد ، فەرمووی شیعرەکانت بخوێنەوە . مەلاعوسمان خرپلەییێکی ئەستوور ، لە قسەکردن‌و مەعلووماتا فەسیح‌و بەئیقتیدار بوو ، تورکی‌یشی چاك ئەزانی‌و کەمێکیش کوردی ، حەتتا گۆرانیی بە زوبانی کوردی ، هي زەمانی قەدیمی ، بۆ[٢] شێخ ئەگوت ، ئەشراف‌و ئەوانەی لە مەجلیسا بوون لە گفتوگۆی حافز عوسمان موتەحەییر مابوون ، ئەوەندە تێگەیشتوو و دانا بوو . دەستی‌کرد بە خوێندنەوەی شیعرەکانی :

**لبنى الخضراء قد وافى الهنا**

**و سليمانية الفضل المزيد**

---

(٢) لە دەسنووسەکەدا نووسرابوو «بو بو» . ئێمە یەکێکیانمان بە زیاد زانی ، مەگەر بڵێین لەپێش «هي زەمانی . .»یەکەوە «کە»یەك پەڕیوە .

حين باليمن أتى أسعدهم
دار سعد قصرها العالى المشيد
بيت ابراهيم اذ انحل[٣] به
و كلا الفردين من بيت مجيد
صار محبوب القلوب اذ غدا
ضيف سلطان الورى عبد الحميد
كيف لا وهو ابن (كاكا احمد)
فرع طه المصطفى الهادي الرشيد
فلهذا قلت في تأريخه :
«بهناء قدم الشيخ السعيد»[٤]

شێخ و حازران تەقدیرو تەشەککوریان کرد . لەپاش سەعاتێ دانیشتن ئیزنی خواست و ڕۆی . وەعدیشی دا کە هاتوچۆ بکا ، هەموو هەفتەیێك بێتەوە بۆ خدمەت شێخ .

لەپاش هەفتەیێك لە گەیشتمان بە ئەستەنبوولێ خەیات لەتەرەف پادشاوە هات کە ئەندازەی بەدەنی هەموو هەیئەتی سەفەری بگرێت ، لیباسمان بۆ بکەن . خەیاتەکە ، هەرکەس بەگوێرەی خۆی ، بەعزێ لیباسی مولکی ، بەعزێ عەسکەری ، بەعزێ عیلمی ، ئەندازەی بەدەنیان[٥]

(٣) ئەبوو «حل» بووایە .

(٤) بە حیسابی حورووفی ئەبجەد ئەکاتە ١٣١٩ (١٩٠١–١٩٠٢) . زێوەر خۆیشی بە ژمارە لە داوێنی دوا نیوبەیتەوە ساڵەکەی نووسیوە .

(٥) ئەبوو «بەدەنی» بووایە ، چونکە زەمیرەکە بۆ (خەیات) ئەگەڕێتەوەو ئەویش تاقەکەسێکە .

گرتین . هەرکەس موناسبی خۆی ، هیندێ بەرگی عیلمی ، هیندێ مولکی ، هیندێ عەسکەری ، هەریەکەمان دەستێ لیباسی چۆغەو فاسۆنی نایابمان بۆ کراو ، ڕۆژبە ڕۆژ شێخ لە نەزەری سولتانا قەدری زیاد بوو[٦] . بۆ هەرکەس ڕجای بکردایە قوبوولێ ئەکرا . یەك دوو دەفعە لە مابەین یەعنی لە ماڵی پادشاە مەولوودی نەبەوێ ئەخوێنرا[٧] ، شێخ لەگەلێ براکانیو شێخ مەحموودو مەلا عەلیی کانیکەوەیی حازری ئەو مەولوودانە ئەبوون . خولاسە سێ مانگ لە ئەستەنبوولێ ماینەوە ، شێخ هەر خەریکی ئیشوکاری موسوڵمانانو[٨] ، بۆ عولەمای سولەیمانیو بەعزێ جێگایتر وە بۆ ئەو کەسانەی لە خدمەتیا بوون گەورەو بچووك مەعاش تەخسیس کراو ، هیندێك بە وەزیفەی گەورە مەسروور بوون . لە ئاخردا شێخ ئیرادەی حەجو زیارەتی بەیتوڵڵاهی کرد . بە واسیتەی سەرکاتبی شەهریاری ئیرادەی شێخ بە پادشاە گەیشت ، زاتی شاهانە موافەقەتی فەرموو . سەیید عومەرو شێخ مەحموود ئارەزووی چوونە حەجیان نەبوو ، ویستیان بێنەوە[٩] بۆ سولەیمانی . شێخ پێی ناخۆش نەبوو . عەودەتیان بۆ سولەیمانی عەرزی پادشا کرا ، پادشا ڕەزامەندیی نواند وە شەشسەد لیرە بۆ خەرجی ڕێگاو سواربوونی واپۆر بەخۆراییو خواردنو خۆراك هەتا لە بەحر دەرئەچن . لەسەر ئەمانە ئیرادەی شاهانە سادر بوو . لەپێش حەرەکەتی شێخ بۆ حیجاز ، ئەمان بۆ سولەیمانی کەوتنە

---

(٦) ئەبوو «زیاد ئەبوو» بووایە .

(٧) ئەبوو «ئەخوێنرایەوە» بووایە .

(٨) ئەبوو «بوو» بووایە .

(٩) ئەبوو «بگەڕێنەوە» بووایە .

ڕێگا . تەبیعی منیش لەخدمەت شێخ مەحموودا بووم ، لە ڕێگای حەڵەبەوە هاتینەوە بۆ مووسڵ‌و سولەیمانی .

مەقسەد ، تەئریخی پادشاهانی عوسمانی‌و غەیرەم زۆر دیوە . سوڵتانی وەك عەبدولحەمید خان بەئینعام ، بە ئیحسان ، بە ئاساردانان کەم‌بووە . تەئریخ‌نووس لە سیاسەتی هەرچی ئەنووسێ حەقی نی‌یە کە ئیعتیراز بگرێت . چل ملیۆن میللەتی جاهیل‌و ، مەئموورو مووەززەف هەموو خائین ، تەنها شەخسێ هەر وا ئەتوانێ ئیدارەی بکا . وە (شفاهاً) بە شێخی فەرمووبوو میللەت سەویەی ئەوەی نی‌یە ئیدارەی مەشرووتەیان بدەمێ . بە هەموو فکری خۆم سەعی‌ئەکەم ، مەنعی خائین ناکرێ . قسەکەشی ڕاست دەرچوو . ئیتتیحادچی چوون بەگژیا ، مەشرووتەیان ئیعلان‌کرد ، (ڕۆم‌ئیلی)یان بەجارێ لە کیسی دەوڵەت دا . وەقت‌بوو بوڵغار ئەستەنبووڵیش بگرێت‌و خیانەتی ئیتتیحادچی‌یەکانیش لە میللەتەوە ئاشکرا بوو . عەقڵ‌و فەراسەتی عەبدولحەمید خان لە ئاورووپاشدا تەقدیر کرابوو . غەرقی ڕەحمەتی یەزدانی بێ .

# قەومی کورد

کورد قەومێکە لە تەئریخا ناویان نەشارراوەتەوە . شەجاعەت‌و مەردایەتی ، جوودو مرووەتی[1] لە تەئریخی بێگانەو خۆمانە نووسراوە . من حەقی ئەو تەفصیلاتەم نی‌یە کە حوکوومەت‌و سەردارو حاڵ‌و ئەحواڵی کۆنیان بنووسم . من کەسێك ئەنووسم کە بە کردەوەی جوان‌و ئەخلاقی گەورە مەعلووم بێ‌و خدمەتی بێ‌ریای بە دین‌و میللەت کردبێ . (گەنجینەی مەردان) تایبەتی هەر بۆ ئەو پیاوانەیە کە بە سیفات لایق‌و ، بە خدمەت‌کردن بە بەنی‌بەشەر قوسووری[2] نەبووبێ ، وە ئیللا میللەتی کورد ، نەڵێم من خۆم کوردم ، بێ‌تەرەفانە ئەینووسم ، هەر کوێخا دێ‌یەك لە کوردستانا حاتەمێکی تائی‌یەو ، هەر سەرکۆماری لە عەشایر بەحیای بەرمەکی‌یە . سەییاحان ئەتوانن چەند ساڵ لە کوردستانا گەردش بکەن فلسێك بۆ نان‌و ئاو سەرف‌نەکەن چونکە هەر دێ‌یەك کە مزگەوتی تیابێ عیبادەتخانەو میهمانخانەیە ، غەریب کە رووی‌کردە ئەو مزگەوتە ئێوارە لەپاش جەماعەت یا کەسێ ئەیباتەوە بۆ ماڵی خۆی ، یا خادیمی مزگەوت

---

(١) ئەبوو «مرووەتیان» بووایە .

(٢) ئەبوو «قوسووریان» بووایە .

له ماڵیٚ خۆراكو پێخەفی بۆ دەهێنیٚ ، ئیحتیاج بە كرِینی نانو پیٚخۆر ناكا ، پێچەوانەی وڵاتی فەرەنگستانە ، لە شارانی فەرەنگ كە ئەورووپای پیٚئەڵێن پارەت لە باخەڵا نەبیٚ لەبرسا ئەمریو كەسیش سواڵكەر ناخوێنێتەوە .

* * * * *

لە میللەتی كورد عەشیرەتی بەناوبانگ لە وڵاتی ئێمەدا عەشیرەتی جافە . میقداری پازدە هەزار خانە ئەبنو ناویان لە قەدیمەوە بۆ هەر تیرەیەكیان دانراوە وەك (رِەشوبۆری ، مكایەڵی ، رِۆغزادی ، تەرخانی ، هاروونی ، شاتری ، گەلاڵی ، سادانی)و غەیری ئەمانە كە زۆر وردە عەشیرەتیان لەناودایە . رِەئیسو سەرداری ئەم عەشیرەتە گەورەیە ئەمیرولئومەرا مەحموود پاشای كورِی موحەممەد پاشا بوو . ئەویش ئیدارەیەكیوا جوانی ئەكرد ئەم لافاوی وەحشەتە نەیانئەتوانی بەئاشكرا پووشیٚ بفرِێنن . ئەگەر غەدریٚ وە زوڵمێكیان لە ئەهلی دێهاتیٚ بكردایەو خەبەر بە پاشا بگەیشتایە دەستبەجیٚ سواری ئەنارد بۆ لابردنی مەغدووریەتی ئەوكەسە .

مەحموود پاشا لەئەترافی بەغداوە هەتا حودوودی شاری سنە حوكمی رِەوا بوو . مەئموورانی رِۆمو عەجەم ئیشێكیان بوایە كە بە خۆیان پێك نەهاتایە موراجەعەتیان بە پاشا ئەكرد . بیٚمەحكەمە ، بیٚپۆلیس ، بیٚ عەسكەر ، لە خانەقینەوە هەتا مەریوانو سەقزو بانە ئیشوكاری ئەم عەشیرەتە گەورەیە دروستئەبوو ، خۆی تەرتیباتی كردبوو . كەیخوسرەوبەگی كورِی رِەئیسی هەموو عێل بوو و هەر تایفەیەك ئیشو

کاریانی دابووە دەست کوڕێکی وە خۆی بەئیستیراحەت‌و عیبادەت‌و ڕاوو شکار مەشغووڵ بوو .

نەختێ لە نان‌و خوانیان بنووسم :

جەنابی شێخ‌مەحموود کە تەشریفی بۆ تەعزیەی عوسمان پاشای برای مەحموودپاشا – کە کوڕی مردبوو – ئەچوو بۆ هەڵەبجە ، منیش لەخدمەتیا بووم . نزیك سی سوار خدمەتکارو غەیرە لەخدمەتیا بووین . لە (بێستان‌سوور) تێپەڕمان‌کرد . ئەو دەشتی شارەزوورە مالامال‌بوو(٣) لە ڕەشماڵ ، لە دەوار . غەیری شەقامەکە ڕێگا نەبوو کەس پیا بڕوا . چرەبەندانێ بوو وەك ئۆردووگای ئەسکەندەر . ڕەوەی ئەسپ‌و ماین ، ڕانی بزن‌و مەڕو گاگەل ، هاتوچۆی سوارەی کوردان‌و پیادە ڕووەو ماڵ ، قیامەتێ بوو چاومان پێ کەوت . ڕۆژیش سەعاتێکی مابوو بۆ مەغریب . ئێمەش کەوتینە گفتوگۆ : ئایا ڕووبکەینە کوێ ؟ قەرارمان‌دا میوانی جاف بین نەچین بۆ دێهات . لە یەکێکمان پرسی ئەم هەوارە چ‌تیرەیەکی لێ ئەبەزێ ؟ گوتیان ئێرە هەواری ڕۆغزادی‌یە . پرسیمان گەورەیان کێ‌یە ؟ گوتیان ساڵحی کاکەخان . خەبەری ماڵیان پرسی ، بە ئیشارەت دەوارێکی گەورەیان نیشان‌داین . ئێمەش ئەم کوێخایە ناناسین ، ناچار دوو سوارمان لەپێشەوە نارد کە خەبەربدا کە شێخ‌مەحموود ئیمشەو لێرە میوانە . سوار ڕۆیشتن . ئێمەش دوابەدوای ئەوان جڵەوی ولاغمان وەرگێڕا ، ڕوومان‌کردە دەواری کوێخا .

کە نزیك دیواخان بووینەوە ، بیست سی زەلام بەپیرمانەوە هاتن ، ولاغیان لێ گرتین . دابەزین ، ڕوومان‌کردە دیواخان . دۆشەك

(٣) مالامال : پڕ .

ڕاخرابوو ، سەماوەر حازر ، چای دەمکرابوو ، بەئیستیراحەت دانیشتین . دیققەتمکرد لە جافەکان یەکێکیان دانەنیشتووە ، هەموو دەستەونەزەر لەخدمەتِ شێخا ڕاوەستاون‌و نازانین کامیان ساحێب دیواخانە . عەرزی شێخم کرد ئەمر بکا کوێخا ساڵح خۆی دابنیشێ ، نەمان‌ئەناسی کوێخا کامەیە . لەخۆمەوە بانگمکرد کوێخا ساڵح ! یەکێ جوابی دایەوە . پێمگوت شێخ ئەمر ئەکا تەشریفت دانیشێ . شێخیش کە ناسی ، حوکمی لێ کرد ، بەزۆر کوێخامان دانیشاند . باقی جافەکان ئالأبوونە ئیش‌و خدمەتکردن ، یەکێ چای دادەنا ، یەکێ جغەرەی دەهێنا ، بەجارێ هەموو لە حەرەکەتا بوون . نوێژی مەغریب کرا ، لە چاخواردن بووینەوە ، سفرە هاتە پێشەوە ، خواردەمەنی ڕیزکرا . لەپاش خواردن دووبارە سەماوەر کەوتەکار . هەتا سەعات سێی شەو هەر قسەی خۆش‌و مەحەببەت‌و چاخواردنەوە بوو . ئەوشەوە لەلای ئەو قەومە نەجیبە وەکوو شەوی جەژن‌و ڕۆژی شادی‌و فەرەح بوو . بۆ ئیستیراحەتی ئێمە جێگای نووستن‌و ڕاکشانیان ڕێکخست .

بەیانی کە نوێژمان کرد ، بەرچایی : ماست ، کەرە ، پەنیر ، گۆشتی برژاو لەگەڵ نانی ساجیی جوان هاتە بەردەستمان . دووبارە بە چاخواردنەوەو قسەی خۆش خۆش مەشغوول بووین ، نزیك دوو سەعات لەناویانا ماینەوە . شێخ ئەمری فەرموو وڵاغ بێنن . بەجارێ هەموو وڵاغ بە زین‌و لغاوەوە بۆمان ڕاگیرا . سوار بووین ، دوعاخوازیمان کرد . بۆ ڕەوانەکردنمان بەپیادەیی سەد زەلام زیاتر لە جڵەوی وڵاغی شێخەوە پێش‌کەوتن . لەپاش نیو سەعات ڕێگا بە زۆر گەڕانەوە .

که ماینه‌وه خۆمان ، به‌ناو خێڵ‌و عه‌شیره‌تدا ئه‌ڕۆیشتین ، نزیك ده‌وارێکی گه‌وره بووینه‌وه ، گوتیان ماڵی که‌یخوسره‌وبه‌گی کوڕی پاشایه . واامان به موناسب زانی لابده‌ینه ماڵی که‌یخوسره‌وبه‌گ . که ڕوومانکرده ده‌واره‌که‌ی ، خدمه‌تکار هاتن به‌پیرمانه‌وه ولاغیان لێ گرتین ، به‌ته‌رتیب‌و ته‌میزی دیواخانی شاهانه بوو ، به‌گ ده‌ستبۆسیی له‌گه‌ڵ شێخ کرد . سه‌ماوه‌رو چا ئاماده بوو ، به خدمه‌تکردن‌و قسه‌ی خۆش‌و چاخواردنه‌وه دوو سێ سه‌عات مه‌شغووڵ کراین . به‌گ فه‌رمووی نابێ ته‌شریفتان بڕوا ، نه‌هار لێره بکه‌ن . ماڵی پاشا نزیکه ، پاش نیوه‌ڕۆ ته‌شریفتان میوانی پاشا بن . ئیتاعه‌ی قسه‌ی کرا . ئه‌و قاوه‌ڵتی‌یه له‌خدمه‌ت که‌یخوسره‌وبه‌گ به‌مه‌حه‌ببه‌ت‌و یه‌کێتی ڕامانبوارد . وه‌قتی نیوه‌ڕۆ دووباره چا خورایه‌وه ، ولاغ حازرکرا ، ڕووه‌و ماڵی پاشا سواربووین .

که نزیك بووینه‌وه ڕوانیم باره‌گاو ده‌ستگاو هۆردووگایه‌ك ده‌رکه‌وت نموونه‌ی باره‌گای جه‌مشیدی . خێوه‌تی پاشا به‌جوێ ، ده‌وارێکی گه‌وره له ته‌نشتیه‌وه بۆ میوان ، به ڕیزه ده‌واری به‌گزاده‌کان‌و خدمه‌تکاران . له‌سه‌ر ئه‌و چیمه‌ن‌و سه‌وزه‌گیایه کورسی‌و ئه‌سکه‌مل ڕیزکرابوون ، وه‌ك قه‌سری به‌هه‌شت ئارایش‌و(٤) ڕازابوونه‌وه . ئێمه گه‌یشتینه پێشه‌وه . خدمه‌تکار هاتن ولاغیان لێ گرتین . شێخ ته‌شریفی چووه خێوه‌تی پاشا ، ئێمه‌ش چووینه دیواخان . چای حازر بوو . به چاخواردنه‌وه زه‌مانێ گیراین . له‌پاشا ئێمه چه‌ند که‌سێ بۆ نوێژکردن‌و ته‌فه‌ڕڕوج‌و سه‌یران چووینه سه‌ر چه‌مه‌که . ئه‌و ده‌شته ده‌شتی خه‌تاو خوته‌ن بوو ، ئه‌و مێرگ‌و مێرغوزاره جه‌ننه‌تی عه‌دن بوو ، هه‌وای پاك‌و ته‌میزیش ده‌وای ڕۆح‌و به‌ده‌ن . گوتم

(٤) ئه‌بوو «ئارایش درابوون‌و» بووایه .

عومر ئەو عومرەیە کە بەگزادەی جاف ڕای ئەبوێرێ . هەزار فەزڵی پاشا بەسەر سوڵتانی ڕۆم‌و عەجەمدا هەبوو ، چونکە ئەم سەربەست ، بە ئارام ، بە ئاسایش ژیان ڕائەبوێرێ . ئەوشەوە هەمووممان لە دیواخانی پاشا بووین . کە ڕۆژبووەوە عەلی‌بەگی کوری پاشا جوابی نارده خدمەت شێخ کە هەڵەبجە نزیکە ، ئەبێ ئەم قاوەڵتی‌یە میوانی من بن ، تەشریفتان نەڕوا . ڕجای قوبوولْ کرا . منیش لە حوکوومەتی پاشاو هاتوچۆی عەشایر لە هەرلایەکەوە دیققەتم ئەکرد ، ئەو زاتە ئەم هەموو حەشەراتە(٥) ڕووی تێ‌ئەکرد ، هەرکەس بە مەرامی خۆی ئیشی بۆ ئەکرا وە دەگەڕانەوە . ئەگەر مەسئەلە موهیم بووایە حەواڵەی یەکێ لە بەگزادەی ئەکرد کە دروستی‌بکاو ڕێکی‌بخا . خۆشی لەگەڵ شێخ‌غەنی ناوێ کە نەدیم‌و قازی‌و کاتبی بوو یاریی دامەیان ئەکرد .

هەروا بە گەڕان‌و سەیران ڕامانبوارد تا وەقتی چوونە ماڵی حەمەعەلی بەگ هات . کە چووین ، سەیرم کرد لەسەر ئەو دەشتی زومورڕەدینە کورسی‌و ئەسکەمل ڕێکخرابوون‌و فەرش‌و دۆشەك بەجیا لەسەر سەوزەگیا . لە دوو لاوە سەماوەر زیرەی ئەهات ، وە چەند شەخسێ لە بەگزادە لە خدمەت حەمەعەلی بەگدا دانیشتبوون ، بەپیر شێخەوە هاتن . سێ خوان تەرتیب‌کرابوو ، یەکەم بۆ بەگزادەو شێخ ، دووەم بۆ قیسمی ئێمە ، سێ‌یەم بۆ سوارو خدمەتکاران . دەست‌کرا بە تەعام‌هێنان‌و دانان . جارێ وەك ماڵێکی زۆر گەورەو دەوڵەمەند لە مانگی ڕەمەزانا ئیفتاری‌یە(٦) بۆ خۆی دروست‌بکا ، وام چاوپێ‌کەوت . لەو مەوسیمی

(٥) لەم جۆرە شوێنەدا «عەشامات ، حەشامات» ئەوترێ .

(٦) ئیفتاری‌یە : بەربانگ .

بەهارەدا لەسەر خوان کە ڕیزکرا ، ئەنواعی مورەبباو کولیچەو شەکرلەمەو پاقلاواو فنجانبڕو قاپە فرنی هاتە پێشێ . لەپاش ئەمانە پلاٚوی برنجی سەدری لەگەڵ ئەنواعی چێشتی لە گۆشت دروستکراو کە ناوی زۆریانم نەدەزانی ، ئامادەکراو ، لەو تەعامانەی بۆ ئێمە هاتبوو عەینی ئەوەش بۆ سوارو خدمەتکار دانرابوو . بە خۆشیو مەحەببەتێکی زیاد ئەو قاوەڵتییەمان لەخدمەت کوڕی پاشادا کرد .

پاش نیوەڕۆ سواربووین چووینە هەڵەبجە ، لە ماڵی مەجیدبەگی کوڕی عوسمانپاشا میوان بووین . ئاساری میواننەوازی لەوێشدا ئاشکرا بوو . شێخ بەڕەسمی فاتیحە خوانی لەگەڵ مەلا ئەحمەدی شینکی کە مودەرڕیسی مزگەوتی گەورەی سولەیمانی بوو وە شێخ لە خدمەت خۆیا هێنابووی ، چوونە خدمەت عوسمانپاشا .

دوو سێ شەو لە هەڵەبجە ماینەوە . لەتەرەف تاهیربەگی کوڕی عوسمان پاشا دەعوەتێکمان بۆ کرا چەشنی دەعوەتەکەی عەلیبەگ . بەڕاستی دیواخانو نانو خوانی عوسمانپاشا خوانی یەغما[7] بوو ، نەك بە خوسووسی ، بە دائیمی وابووە . غەیری سەخاوەتی ئیحسانو ئینعامیشی بێمیسل بوو . بۆ تەعمیری مزگەوتی گەورە لە سولەیمانی کە لە زەمانی بابانەکانەوە کرابوو و ڕووی لە خراپی[8] بوو ، بەجارێ پێنجسەد لیرەی عوسمانیی بۆ نارد کە سەرفی تەعمیراتی بکەن ، وە بۆ عولەمای هەڵەبجەو ئەترافی ئیحسانی دەوامی ئەکردو ، تەبیعەتی ئەوەندە بەرز بوو کە بهاتایە سولەیمانی میوانی کەس نەدەبوو ، خانووی خوسووسیی ئەگرت . هەروەك

---

(٧) یەغما : تالاٚن .

(٨) خراپی : وێرانی .

**تاهیر بەگی جاف**

هەڵەبجە ، ئەهلی سولەیمانیو مەئموران ئەچوونە دیواخانەکەی . بۆ سەخاوەتی عوسمانپاشا هەرچەند بنووسرێ ڕاستە . خوا لە قیامەتیشدا ساحێب نیعمەتی کا .

لەپاش چەند ڕۆژێ کە لە[9] هەڵەبجە ماینەوە ، دوعاخوازیمان کرد ، هاتینەوە ماڵی مەحموودپاشا .

---

(۹) ئەم (لە)یە لە دەسنووسەکەدا نەبوو ، بەڵام پێویست بوو بێ . لاموایە لە نووسینەوەدا لەبیرچووبێ .

# مەحموود پاشای جاف

مەحموود پاشا زاتێکی بە ئیعتیبار ، بە تاعەت ، بە عیبادەت ، بە ئیحسان ، بە ئینعام ، بە عەدالەت ، بە حوکم بوو . عادەتی وابوو کە نوێژی بەیانیی ئەکرد لەسەر بەرماڵ هەڵنەدەستا قورئانو دەلایلی ئەخوێند هەتا هەتاو گەرمئەبوو ، ئەوسا سوننەتی ئیشراقی ئەکرد . لەپاش ویردو سوننەتکردنو قورئانخوێندن تەشریفی ئەهاتە مەجلیس . سەماوەر حازر بوو ، میوانی خوسووسی لەخدمەتیا کۆئەبوونەوە . ئیشوکاری عەشایر ئەگەر ببوایە ڕێك ئەخرا .

ئەم زاتە دوو دەفعە لەتەرەف سوڵتان عەبدولحەمیدەوە تەکلیفی وەزیریی لێ کرا ، قوبووڵی نەکرد . مانگی پەنجا لیرەی لەتەرەف حوکوومەتەوە هەبوو (حق السکوت) . ئەو مەعاشەی بۆ تەخسیس کرابوو کە ئیتاعە بە حوکوومەت بکا ، باوجوود عەقیدەی کورد ئەوسا وابوو کەسێ بچێ بەگژ حوکوومەتاو[1] خەلیفەی ئیسلاما کافر ئەبێ . وەئیللا مەحموود پاشا ئەیتوانی لە هەورامانەوە هەتا مووسڵ داگیری بکا . لەگەڵ ئەو هەموو نوفووزەی وەك شەخسێکی بێدەسەڵات تابیعی ئەمری حوکوومەت بوو . سەبەبیشی دیانەت بوو .

---

(١) ئەبوو «حوکوومەتو» بووایە .

مەحموود پاشای جاف بە بەرگی پاشایی‌یەوە

لە خوسووسی ئیحساناتەوە من لە سەد پێنجی نازانم . هەر ئەوەی مەشهوورو لە بەرچاو بووبێ نووسیومە . لە قزراباتەوە هەتا مەریوان ، ئەو دێیانەی قەڵەمرەوی جاف بوو[٢] ، مەعاش بۆ مەلا ، وەقف بۆ مزگەوتەکانیان لەتەرەف پاشاوە مەعلووم کرابوو . لە نەفسی سولەیمانیدا هەموو مەلاو مودەرریس‌و زۆر لە ساحێب خانەدانی لێقەوماو مووچەو بەراتیان هەبوو . جگە لەم ئیحسانە دائیمی‌یەی هەر شێخ‌و مەلاو دەروێش‌و فەقیر[٣] کە[٤] رووی‌بکردایە ماڵی ، بەمەحروومی نەدەگەڕایەوە . هەموو ساڵێ چەند کەسێ موراجەعەتیان پێ ئەکرد بۆ چوونە حەج ، پارەی حەجی ئەدانێ ، مەئیووسی نەدەکردن .

حیکایەت خوانەکەی کەیخوسرەوبەگ بۆی گێڕامەوە : پاشا ناردی بەشوێنما چەند شەوێ حیکایەت بۆ ئەو بکەم . چوومە خدمەتی ، شەو کتێبم بۆ ئەخوێندەوە . ڕۆژیش لە دیواخان لەگەڵ میوان‌و خدمەتکار رامئەبوارد . ڕۆژێ سەیرمکرد مەلایەکی مێزەربەسەر هات . پاشاش تەشریفی لە دیواخان بوو لێی‌پرسی : مەلا تەشریفت لەکوێوە دێت ؟ عەرزی‌کرد : پاشا ، لە ئێرانەوە . باسی کەرەم‌و ئیحسانی ئێوەم بیستووە ، بەئومێدی ئەوە کە موعاوەنەت بفەرمووی منیش بچم بۆ حەج[٥] . پاشا فەرمووی بەخێر بێیت باشە ، ئەمما هێشتا بۆ چوونە حەج موددەتێکی ماوە . مەلاش وتی تازە پێم‌ناکرێ بچمەوە ئێران ، بە نی‌یەتی زیارەتی

---

(٢) ئەبوو «بوون» بووایە .

(٣) ئەبوو «فەقیرێ» بووایە .

(٤) ئەم «کە»یەش پێویست نی‌یە .

(٥) ئەبوو لێرەدا ڕستەیەکی وەکوو «هاتوومە خدمەت» بووایە .

بەیتوڵلاە دڵم لە ماڵو مناڵی خۆم هەڵکەندووە . ئەم دیواخانە ڕۆژی سەدکەس نانی لێ ئەخوا ، منیش لە گۆشەییەکەوە نانێکم دەستئەکەوێ هەتا حاجی‌یان ڕێك ئەکەون . پاشا فەرمووی ئارەزووی خۆتە دانیشە ، ڕەفیق ڕێگا زۆر ئەبێ . مەلا مایەوە . لە خوار دەوارو دیواخان شیوو کەندەلانێ هەبوو چووە ئەوێ بەقەدەر جێگای زەلامێ لە کەندەلانەکەی دابڕی[٦] ، بەرماڵی لێ داخست ، دەستی‌کرد بە قورئان خوێندن ، شەوو ڕۆژ ئەو جێگایەی چۆڵ نەدەکرد ، یا نوێژی ئەکرد یا قورئانی ئەخوێند . بۆ نان خواردنیش ڕووی نەدەکردە دیواخان ، خۆی وا بردبوە دڵی ئەو عالەمەوە کە ئەمە قوتبی زەمانە . مەجبوور نۆکەر نانیان بۆ ئەبرد . مەلا هەتا مەوسیمی حەج دەوامی‌کرد . ڕۆژێ پاشا بانگی‌کرد ، وتی مەلا ئەگەر تەشریفت ئەڕوا ، ئیستا لە سولەیمانی حاجی‌یان تەدارەك ئەکەن ، تۆش پارە وەرگرە ، خوا حافیز ، دوعای خێرمان بۆ بکە . مەلا وتی بەڵێ حازرم . پاشا ئەمری‌کرد بیست لیرەی عوسمانی‌یان تەسلیم‌کرد وە بۆ سولەیمانی خستیانە ڕێگا . لەپاش دوو سێ مانگ پاشا تەشریفی چوو بۆ بەغدا ، خدمەتکارێ هات عەرزی‌کرد مەلای حاجی وا لە بەغدایە کووتاڵ ئەکڕێ . پاشا وتی لێی‌بگەڕێن کەیفی خۆیەتی . موددەتێکی پێ‌چوو عێل ڕووی‌کردە کوێستان . ماڵی پاشاش لە ئەترافی پێنجوێن ڕەشماڵی هەڵدابوو . ڕۆژێ سەیرم‌کرد خدمەتکار مەلایان هێنا بۆلای پاشا ، عەرزیان‌کرد دووکانی داناوە ، ئەوەی لە بەغدا کڕیویە لێرە ئەیفرۆشێتەوە . پاشا لێی‌پرسی مەلا بۆچ لە حەج پاش‌کەوتووی ؟ گوتی لە ڕێگا ڕووت‌کرامەوە ، ئیرادەم بوو خۆم بێمەوە خدمەتت کە بمنێری‌یەوە بۆ

---

(٦) ڕەساتر بوو بیوتایە : «بەقەدەر جێگای زەلامێکی لە کەندەلانەکە دابڕی» .

حیجاز . پاشا فەرمووی خاسە ، بێرەوە . هیچ قسەی پێ نەگوت . وەقتی چوونە حەج هات ، ڕوانیم مەلا هاتەوە خدمەت . پاشا فەرمووی دانیشە هەتا ئیشت دروست‌ئەبێ . مەلا ئەوشەوە مایەوە . پاشا کاغەزێکی بۆ سولەیمانی بۆ لای حاجی ئەحمەدی مووسڵی نووسی کە ئەم زاتە هەتا مووسڵ مەسرەفی نان‌و کرێ ولاغی بدەرێ‌و بیست لیرەشی بۆ حەواڵە بکەو بۆ وەکیلت بنووسە ئەویش هەتا حەڵەب ڕەوانەی بکا ، پارەکەی تەسلیم مەکەن . وەکیلی حەڵەبیش بەورەنگە ڕەوانەی بکا ، هەتا سواری واپۆڕ نەبێ حەواڵەکەی تەسلیم مەکەن . پاشا بەم‌ڕەنگە مەلای نارد بۆ حەج .

ڕەفیقێکم بۆی گێرامەوە کە : بۆ تیجارەت چوومە سنە . کە ماڵ‌و ئەشیامان کری ، ڕێگای مەریوان نائەمین بوو ، لە هەورامانەوە هاتینەوە هەڵەبجە . ماڵی پاشا لەسەر ئاوی زەڵم بوو ، خەبەری بیست کە ئێمە لە ئێران هاتووینەوە ، دوو سواری ناردە سەرمان کە بچینە ماڵی پاشا . کە چووین بەخێرهاتنی کردین ، ئیلتیفاتی زۆری نواند ، فەرمووی غائیلەتان نەبێ هەرچیتان لێ بستێنین قازانجتان ئەدەینێ ، ئێوە کاسبن شوێن نەفع کەوتوون ، بارتان بکەنەوە بزانم ئەوی بەکاری ئێمە بێ بیستێنین . ئێمەش بارمان کردەوە ، هەموو ئەشیامان لە بەرچاوی ڕانواند . میقداری چەند تۆپێك خامەك‌و چیت وە مشکی‌و سرکەیی جیا کرایەوە ، فەرمووی ئەمانە بەشی ئێمەیە ، نرخی چەندە ؟ ڕاستەکەی نرخی خریدی پێنج‌سەد قران ئەبوو ، عەرزمان‌کرد بایی هەزار قرانە . فەرمووی خاسە . حەقەکەتان پێ‌ئەدەین . ئیتر باری خۆتان ببەستنەوە .

هەروا مەجلیس گیرابوو ، سەیرم‌کرد سەیدێکی شاڵی سەوز بەسەرەوە ، سواری گوێدرێژێ بووە هات . کەرەکەی بەستەوە . خۆی

هاتە پێشەوە ، دەستبۆسی لەگەڵ پاشا کرد . پاشا فەرمووی دانیشە سەیید ، تەشریفت لەکوێوە هاتووە؟ سەیید بەچۆکا هات ، عەرزی کرد لە زەنگنەوە هاتووم . خەبەراتی ئەو ناوەی لێ پرسی ، سەیید جوابی ئەدایەوە . لەپاش نیوسەعات ڕوانیم لۆتی یەك زوڕنای بەپشتەوە هات ، سەلامی کرد ، لەلای خواروو دانیشت . ماندوونەبوونیی ئەویشیان کرد ، وەقتی قاوەڵتی هات ، نانیان دانا ، هەرکەس بە دەرەجەی خۆی سینیی بۆ دانرا . لەپاش نانخواردن دەستودەم شۆررا . پاشا ئەمینداری خۆی بانگکرد گوتی بچۆ پەنجا قران بۆ سەیید وە سەد قران بۆ لۆتی بێنە . سەیید تووڕە بوو ، وتی پاشا بەخوا نامەوێ . بە من کە سەییدم ، ئەولادی پێغەمەر ، پەنجا قران ئەدەی[7] ، سەد قران بە لۆتی یەکە ! پاشا فەرمووی ئەو لۆتی یە زەممانئەکا ، زۆر جێگا ئەچێ ، لە هەرلایەك قسەیەك بکا ئابڕوومان دەبا . سەیید حیددەتی زیادکرد ، گوتی وەڵڵاە نامەوێ . ئەمجا پاشا کەوتە قسەی خۆش ، گوتی سەیید تەشریفت هەتا پشت دەوارەکە بڕوا . کە بانگمکردی بێرەوە . سەیید چووەدەرێ . پاشا ڕووی کردە ئەهلی مەجلیسەکە گوتی ئێوە بە شاهید بن پەنجەی دەستم یەکێکیان پەنجا ، دووەمیان سەد ، سێیەم سەدوپەنجا ، چوارەم دووسەد ، پێنجەم دووسەدوپەنجا قران بێ . لە بەرچاوی مەجلیس مەعلوومی کرد ، بانگی کرد سەیید بێرەوە . سەیید هات . پاشا گوتی لەم پێنج پەنجەیەم یەکێکیان

---

(٧) زێوەر خۆی لەپێشا وای نووسیوە : من سەیید ، ئەولادی پێغەمەر ، پەنجا قران ئەدەی بە من ، سەد قران بە لۆتی یەکە» . پاشان وای لێ کردووە کە ئێمە نووسیومانەتەوە ، بەڵام «بەمن» ەکەی لانەبردوە ، هەرچەند پاش ئەو دەسکاری یە شوێنی نامێنێ . ئێمە لامانبرد چونکە دڵنیا بووین لەیادیچووە لای بەرێ .

بگره ، خۆت‌و بەختت ، هەرچەندێ بێ لەوە زیاترت پێ‌نادەم ، سەیید دەستی‌برد پەنجەیێکی گرت . بە ئەمری خوا پەنجەی پەنجا قرانی بوو . پاشا فەرمووی مەجلیس حەقی سەیید چەندە ؟ هەموو شاهیدیمان‌دا کە پەنجا قرانە . سەیید تووڕە بوو ، ڕازی نەبوو . پاشا گوتی دووبارەی ئەکەمەوە ، بچۆرەوە دەرێ . پاشا پەنجەکانی گۆڕی‌و هەریەکە ناوی میقدارێکی لێ نا وە ئێمەی کردەوە بە شاهید ، سەییدی بانگ‌کردەوە ، بە ئەمری خوا ئەمجارەش پەنجەی پەنجا قرانیی گرت . گوتی سەیید خەتای من نی‌یە ، خوا ئەوەندەی داویتێ ، پێی ڕازی بە . سەیید ناچار پەنجا قرانی وەرگرت .

لە ئاخردا ڕووی‌کردە ئێمە ، گوتی هەر لێرەوە هەتا سولەیمانی خێڵی جافە . ئەم عەشیرەتەش لە هەموو ڕەنگێکی تێدایە . ئێوە بە پارەو کووتاڵەوە بەناویانا بڕۆن ، ئیحتیماله زەرەرتان پێ بگەیێنن ، ئەبێ ئێمە بۆتان بکەوینە ئەزیەت . دەفتەرێکم گرتووە لە سولەیمانی ئەشیامان بۆ بستێنن . ئێوە ئەهلی شارن ، لە پیاوی ئێمە چاکتر سەودا ئەکەن . دوو سوارتان لەگەڵ ئەنێرم هەم ئاگەهداریی ئێوە بکەن ، هەم لە سولەیمانی ئەشیاکانیان بۆ بکڕن . ئێمەش ئەمەمان زۆر پێ خۆش‌بوو . ئەمری‌کرد دوو سوار هاتن پارەی کووتاڵەکەمانی دایە دەستیان کە لە شار تەسلیمان بکەن . ئێمەی خستەرێ . کە گەیشتینە سولەیمانی سوارەکانمان لە ماڵی خۆمان میوان کرد . پارەی کووتاڵیان تەسلیم کردین . ڕۆژ بووەوە . چووینە بازاڕ . موافیقی دەفتەر ئەشیامان بۆ کڕین ، تەسلیمی سوارەکانمان کرد .

ئیحسان‌و خێراتی مەحموود پاشا زۆرە . لە گەرمیان لە کەلار ، لە دەکە ، لە قەرەداغا لە تەکیە ، لە نەفسی قەرەداغ ، لە زۆر جێگای‌تر ، مزگەوت‌و ئەوقافی هەیە . مەدرەسەیێکی لە قزراباتا کردووە وەك

مەدرەسەی نیزامی یەی نیزامولملك ئەبێ ، هەموو مانگێ چل لیرە زیاتر بۆ مەعاشی مودەرریس و تەلەبەو موئەززین و خادیم لە وەقفێ کە بۆی داناوە[8] ، سەرف ئەکرێ . هەتا خۆی لە حەیاتا بوو مونتەزەم ئەم مەعاشانە ئەدرا . لەپاش وەفاتی ، کەیخوسرەوبەگ لێی زیادکرد . لەسەر قەبری پاشا دووکەسی بەئوجرەت گرت کە قورئان بخوێنن . لەپاش کەیخوسرەوبەگ و عەبدوڵڵابەگی کوری بەزیادەوە مانگانەی مەلاو مجەورو تەلەبەیان ئەدا . بە ئیشێك رێم کەوتە قزراباد ، هاتوچۆی لای عەبدوڵڵابەگم ئەکرد ، دیققەتم کرد تەبیعەتی مەردانە ، زۆر چاوی لە پیاوەتی و ئیحسانە . دائیما گولوستانی شێخ سەعدیی بەدەستەوە بوو تەماشای ئەکرد . هاتوچۆی کەسی نەدەکرد . لەپاش ئەو ئەوقافەکە کەوتە ژێرچنگی حەسەن بەگی حەمەعەلی بەگی کوری پاشا . وەکو بیستوومە ئەمیش لاحیقە ، یەعنی رێگای پێشینانی گرتووە .

چاکی و مەردیی مەحموود پاشا ئەوەی من بیستوومە نووسیومە ، وەئیللا سەد چەندانە زیاترە . جارێك ئەچێتە بەرزنجە ، ئەبینێ ئاوی مزگەوتەکەیان کەمە . دەست بەجێ هەزار قران تەسلیمی شێخەکان ئەکا کە کارێزکەن بخەنە سەر بیری کارێزەکەی ، پاکی بکەنەوەو ، فەرمووشی ئەگەر ئەم میقدارە بەشی نەکرد جواب بنێرن چەندی لازم بوو پارەتان بۆ ئەنێرم .

مەلا عەبدولرەحمانی پێنجوێنی کە لە عیلمی عەقڵی یەو نەقڵی یەدا هاوتای نەبوو و لە پێنجوین تەدریسی ئەکرد ، ئیدارەی خۆی و تەلەبەی لەتەرەف بەگزادەی جافەوە تەئمین کرابوو .

---

(٨) ئەبوو «داناوە» بووایە .

هەموو ساڵێ لەتەرەف حوکوومەتەوە ، میقدارێ عەسکەر لەگەڵ زابتێکی گەورەو مەئموورو کاتبو قۆڵچیی ئەغنام ئەنێررانە لای پاشا . ئەوانیش لە دیواخاندا لێی دائەنیشتن. بە ئەمری پاشا بەگزادە بڵاوئەکرایەوە بەناو عێلا ، ڕەسمی ئەغنام ئەسێنرا ، ئەیانهێنایەوە بۆ پاشا . ئەویش ڕەسمی حوکوومەتی ، کە مەعلووم بوو ، جوێئەکردەوە ، وە بۆ مەئموورەکانو زابتی عەسکەرەکان بەشی ئەدانێ. باقیی لە بەگزادەو عەسکەری تەقسیم ئەکرد . هەمووی بەمەسرووری ئەناردنەوە شاری سولەیمانیو بەشی موتەسەڕڕیفو زۆر مەئمووراني عەسکەرییەشی ئەنارد . نەك موتەسەڕڕیف ، والیی مووسڵو موشیری بەغدا[٩] چاویان لە ئینعامی مەحموود پاشا بوو .

زاتێ بوو زۆر عاقڵو داناو بەتەدبیر. شێخ ڕەزای مەشهوور زۆری مەدحکردووە . ئەمە شیعرێ لە قەسیدەی ئەوە[١٠] :

**به محمودی مرا روی نیازاست**
**که صد محمود در پیشش ایازاست[١١]**

لە دنیا بە خۆشیو مەردی ڕایبوارد . ئینشائەڵڵا قیامەتیشی وائەبێ .

---

(٩) ئەبوو «بەغداش» بووایە .

(١٠) واتە : لە قەسیدەکەی شێخ ڕەزایە ، یا لە قەسیدەی مەدحەکەیە . بە مەعنای یەکەم «ئەو» ضەمیرەو «ە» پێوەندکەری موبتەداو خەبەرەکەیە . بە مەعنای دووەم «ئەوە» تێکرا ئیسمی ئیشارەیە .

(١١) نە قەسیدەکە کە زێوەر باسی ئەکاو نە ئەم تاکە بەیتە لە دیوانە لەچاپدراوەکەی شێخ ڕەزادا نین ، بەڵام بەهۆی دۆستی بەڕێزم دوکتۆر حەسەن جافەوە ئاگادار بووم کە ئەوەی زێوەر ناویلێئەنێ قەسیدە ، پارچەیەکی سێ بەیتییە ، ئەو بەیتەی کە زێوەر

---

نووسیویەتەوەو دوو بەیتی‌تر کە ئەمانەن‌و وردەجیاوازی‌یەك لەنێوان بەیتی یەکەمی دوو تێکستەکەدا هەیە هەرچەند مەعنا ناگۆڕێ :

**به محمودی مرا روی نیازاست**
**که صد چون شاه محمودش ایازاست**
**به کیخسرو نژادی میکنم ناز**
**که بر کیخسروانش کبر و نازاست**
**فلك بر درگهش همچون غلامان**
**دولا گردیده ، گویی در نمازاست**

واتە : من ڕووی داوام لە (مەحموود) ێکە صەدی وەك شاە مەحموود (سوڵتان مەحموودی غەزنەوی) لە بەردەمیا وەك ئەیازی وەزیری سوڵتان مەحموودە لە بەردەم سوڵتان مەحمووددا .

من شانازی بە شازادەیەکەوە ، یا بە نەوەیەکی کەیخوسرەو بەگی جافەوە ئەکەم کە مەحموود پاشای کوڕی حەمەپاشای کوڕی کەیخوسرەو بەگە ، کە بەسەر هەموو پادشاهانا فیز ئەکا .

شایەکی ئەوتۆیە ئاسمان بەو بەرزی‌یە لە بەردەرگایا وەك نۆکەر سەری دانەواندووە ، ئەڵێی نوێژ ئەکا !

# نەقیب شێخ مستەفا

لە ساداتی سولەیمانی ، نەوەی حەزرەتی کاك ئەحمەد ، شێخ مستەفای نەقیب ، لایقە لە ڕیزی مەردانا[1] بنووسرێ . زاتێ بوو لە دیانەتا موتەعەسسیب ، لە دنیادا حوڕ ، سەربەست ، بەغیرەت . بۆ وەسفی ئەخلاقی ، ئەم شیعرەی شێخ ڕەزا شاهیدی سادقە کە لە مەدحی ساداتی سولەیمانی نووسیویەتی :

(١) لە دەسنووسەکەدا «مەردانە» نووسرابوو .

## شێخ سەعید سەردارە ، شێخ مارف هەتا حەزکەی نەجیب بۆ جەوانمەردیو شەجاعەت بەینی بەینەڵڵا نەقیب

ڕوتبەی نەقیبی ئەو زەمانە بۆ ئەوە بوو یەکێ لە سادات بۆ موحافەزەی حوقووقی سەییدان لە مەجلیسی ئیدارەی لیوا دائەنیشت . نەقیب شێخ مستەفا کە ئەچوە مەجلیس بۆ موحافەزەی حەقی سەییدو غەیر سەعیی ئەکرد . قسەی ئەو هەموو مەجلیس نەیانئەتوانی ڕەددیبکەنەوە . سەروەتو دەوڵەتی بە واسیتەی فەلاحەتو زەراعەتکردنی خۆیەوە بوو . هەمیشە چاوی لە فەلاحەت بوو . وە لە حاسلاتێ کە بە ڕەنج پەیدای ئەکرد خدمەتی دیواخانو میوانو فەقیرانی ئەکرد . کە مانگی ڕەمەزان ئەهات بۆ تەلەبەو مجەوری هەموو مزگەوتێ لە سولەیمانی شەکرو چاو پارەی ئەنارد . بۆ ئیفتار ، هەر شەوێ تاقمێکی بانگئەکرد ، شەوێك هەموو ئەهلی مەحەللە ، شەوێك هەرچی مەلای مودەرریسو ئیمامی مزگەوتان[2] ، شەوێك هەموو مەئموورانی حوکوومەت ، شەوێك هەموو توجار . خۆلاسە تا مانگی ڕەمەزان تەواو ئەبوو هەر شەوی دەستەیێکی بۆ ئیفتارکردن بانگیکردوونە[3] ماڵی خۆی ، وە بۆ ئەم میوانانە نەفسی خۆی وەك خدمەتکار بەسەریانەوە ئەگەڕا ، قاپە چێشتی دادەنا ، ئاوی ئەهێنا ، قسەی خۆشی لەگەڵ ئەکردن . وە مەلای خوسووسیی هەبوو لە دیواخان تەراویحی ئەکرد . هیچ خدمەتکارێکی نەیئەتوانی ڕۆژوو نەگرێ یا نوێژ نەکا . دایما حافیزی قورئان لە مەجلیسیا هەبوو بۆ قورئان خوێندن . بە ڕێگایەکا تەشریفی کە ئەڕۆیی ژنان خۆیان ئەشاردەوە . هیچ ژنێ نەیئەتوانی

---

(٢) واتە : هەبوون ، یان «هەرچی» بەمەعنای «هەموو» بێ .

(٣) ئەبوو «بانگکردوونە» یا « . . کردۆتە» بووایە .

لەترسی ئەو لە بەردەرگا دابنیشیٚ ، حەتتا هێندیٚ سەرسەری‌و خوێری لە کوران ئیشیان ئەوەبوو بەکۆلاٚنانا ئەگەران کە بیاندیایە ژنان لە بەردەرگا دانیشتوون یەکێکیان رای‌ئەکرد ئەیگوت نەقیب هات ، ژنان لەترسا رایان‌ئەکردە ژووریٚ ، سەرپۆش‌و شتیان لیٚ بەجیٚ‌ئەما ، سەرسەری‌یەکان هەڵیان‌ئەگرت‌و ئەرۆیشتن .

ساڵیٚ باران نەدەباری ، خەڵق ئەچوونە نوێژەبارانە تۆبەو موناجاتیان ئەکرد ، خەبەریان بە نەقیب دا کە سەعیدبەگی مەحموود پاشا کە دراوسیٚ‌و خزمی حەرەمی بوو ، ژنێکی بەقەپاتمە لە ماڵەوە داناوە ، ئەم بیٚ‌بارانی‌یە کە غەزەبی ئیلاهی‌یە لە دوو سیٚ کەسی‌وا بیٚ‌دینەوەیە . گورج خۆی لەگەلٚ خدمەتکاران هەستا چوو ژنەکەی لە مالٚ هێنایەدەریٚ ، ئەمری‌کرد شاربەدەری بکەن . منالٚ شوێنی کەوتن . ئافرەتیان لە جێگای خۆی تەفروتوونا کرد . بە ئەمری خوا دوارۆژ باران باری ، خۆشی کەوتە ولاٚت .

ئاساری خەیری‌یەی لە ساڵێکدا مزگەوتی (تەنگی‌سەر) ، مزگەوتی (داریکەلی) ، مزگەوتیٚ لە مەحەللەی کانی‌ئاسکان . ئەم سیٚ مزگەوتەی تەواوکردو مەلاو ئیمامی بۆ راگرتن . بەرات‌و مەعاشی بۆ مەعلووم کردن . لەرووی ئومەراو مەئموورانی حوکوومەت ریایی‌و مەرایی نەبوو ، سەربەست لەگەڵیان موعامەلەی ئەکردو کەسیٚ پەنای پیٚ ببردایە عەشایر یا غەیر بە هەموو غیرەتی خۆی سەعیی بۆ ئەوکەسە ئەکرد . لەخدمەت کاکیا مەرحوومی شێخ سەعید لە ئەستەنبووڵەوە چوو بۆ حیجاز ، نائیلی زیارەتی بەیتوڵلاٚش بوو . لە مەککەی موکەررەمە وەفاتی‌کرد ، لەویٚ مایەوە لەخدمەت ئەسحاب‌و ئەتباعا (علیه الرحمة) .

شێخ ڕەزای تاڵەبانی

بۆ وەسفی ئەو ئەم غەزەلی شێخ ڕەزایە کافی‌یە :

**دست خیاط ازل خرقۀ ناموس و عفاف**
**خوش بریده‌است به بالای نقیب الاشراف**
**(مصطفی) نام چراغ نسب مصطفوی**
**نخبۀ هاشم و نقد کمر عبد مناف**
**یعنی (نعم الخلف) حضرت کاك احمد شیخ**
**آنکه با شیر زند پنجه به میدان مصاف**
**کمترین جود تو ای زبدۀ اولاد رسول**
**خرج یکسالۀ دولت ز دو لك خانۀ جاف**

خصم‌را تیغ زبان من و شمشیر تو بس
وای ازان روز که این هردو براید ز غلاف
بشکافد دم شمشیر تواش مهرهٔ پشت
بگذرد تیغ زبان منش از حلقهٔ ناف
مدعی گو نزند لاف ز هم‌چشمی او
تکیه بر جای بزرگان نتوان زد بگزاف[٤]

---

(٤) ئەم پارچە شیعرە لە دیوانی شێخ ڕەزادا سیانزە بەیتە ، لەگەڵ هەندێ بەرودوای بەیتەکانو چەند وردە جیاوازی‌یەکیشدا .

مەعنای پارچە شیعرەکە بەم جۆرەیە :

دەستی بەرگدرووی بێ‌سەرەتا ، زۆر جوان ،
پاڵتۆی ناموس‌و داوێن‌پاکیی بە بالآی (نقیب الاشراف) بڕیوە
ئەو نەقیبەی ناوی (مستەفا)یەو ، چرای نەوەی پێغەمبەرو ،
هەڵبژاردەی بەنی‌هاشم‌و ، نەختی بێ‌گەردی نەوەی عەبدولمەنافە
واتە باشترین نەوەی حەزرەتی کاکەحمەدی شێخ
ئەوەی لە مەیدانی جەنگا پەنجە لە پەنجەی شێر ئەدا
کەمترین بەخششی تۆ ئەی پوختەی ئەولادی پێغەمبەر
ئەوەندەی باجی ساڵێکی دەوڵەتە لە دووهەزار ماڵی جاف
دوژمنی تۆ تێغی زمانی من‌و شمشێری دەستی تۆی بەسە
ئای لەوڕۆژەی ئەم دوانە هەردوو لە کێلانێ بێنەدەر
دەمی شمشێری تۆ گازەرەی پشتی کەرت ئەکاو ،
تێغی زمانی منیش لە ئەڵقەی ناوکی تێئەپەڕێ
بڵێ بەوەی لەخۆیەوە ئەدوێ ، بۆ بەرانبەرکێ کردنی ئەو لاف لێ نەدا
مرۆ ناتوانێ لە هیچە پاڵ بە شوێنی گەورانەوە بدا

# ئیبراهیم ئاغای خوبیله

١ – مەناقیبی ئینسانی یەت‌کارانەی ئیبراهیم ئاغا کوڕی موحەممەد ئاغا کە بە ئیبراهیم ئاغای خوبیلە مەشهوورە . دانیشتووی سولەیمانی‌و لە عەشیرەتی کاکەیی بووە . ئەم عەشیرەتە لە گۆرانەکانن کە ئێستا لە ئێراندا هەن . بەهۆی تەوەسسوعی عەشیرەتەکەیانەوە کە سنجاوی‌یان پێ ئەڵێن ، باپیری برایم ئاغا کەوتووەتە سولەیمانی . سنجاوی دانیشتووی موقاتەعەی (چوار ئاب ڕوو) لە ئێرانن کە تابیعی کرماشانن[1] . وەختێ خۆی باپیری گەورەی برایم ئاغا حوکمی ئەو موقاتەعەی کردووە ، لەپاشا هەروەکو گوتمان بە فەتحی سنجاوی کە ئەم ولاّتەیان گرتووەتەوە ، باپیری کەوتۆتە سولەیمانی کە ئەوسایش سولەیمانی تازە بینانراوە . لەپاش بەینێك لەگەڵ حاکمانی بەبە تێکەڵ بووە ، لە سولەیمانی جێگیر ئەبێت .

یەکەم سیفەتی : پیاوێ بووە ناوی عەبدوڵلا چاوزەق ، خەڵقی سولەیمانی ، دانیشتووی گەڕەکی دەرگەزێن‌و کەسبی حەیوانداری (جەڵەب‌چی) بووە ، هەموو ساڵێك لە حەمە پاشای جاف چەند هەزار سەرێك حەیوانی کڕیوە بە پارەی حازرو قەرز ، بردوویەتی بۆ مووسڵ‌و

(١) ئەبوو بیوتایە «کرماشانە» چونکە مەبەستی لە موقاتەعەکەیە .

حەڵەب فرۆشتوویەتی . کە گەڕاوەتەوە قەرزەکەی موحەممەد پاشای داوەتەوە . ساڵێك وا ڕێك ئەکەوێت بەقەدەر پازدە کیسە پارە ، حەیوانی لێ وەرئەگرێ کە هەر کیسەیەك عیبارەت بووە لە پێنج‌سەد قرانی ڕەواجی ئەووەختە . حەیوانەکان ئەبا بۆ مووسڵ ، لەوێ پارە ناکات ، مەجبوور ئەیبات بۆ حەڵەب . لە ڕێگا حەیوان قڕان ئەکەن ، میقدارێکی کەمی بۆ ئەگاتە حەڵەب . خۆلاسە تووشی زیانێکی زۆر ئەبێت . خۆی بە هەر نەوعێك بێت دێتەوە سولەیمانی . موحەممەدپاشا خەبەر ئەزانێ کە عەبدوڵڵا هاتووەتەوە ، نەچوە بۆ لای ، دڵگیر ئەبێ . خێرا دوو سواری جاف ئەکاتە سەر عەبدوڵڵا ، پێیان ئەڵێت بچن لە ماڵی عەبدوڵڵا دابەزن وە لێی[2] غافڵ نەبن . منیش خۆم دێم بۆ شار ، نەوەکوو خەبەر بزانێ خۆی بشارێتەوە . عەبدوڵڵا ئەڕوانێ ئێوارەیەك لەناکاوا دوو سواری جاف لە ماڵەکەیا دائەبەزن ، ئەویش بەقەدەر تاقەتی خۆی خدمەتیان ئەکا وە لەگەڵیان ئەکەوێتە گفتوگۆ . تێ‌ئەگات ئەم سوارانە لەلایەن موحەممەد پاشاوە موحافیزی ئەون تا موحەممەد پاشا دێتە سولەیمانی . شەو بەسەردا دێت ، هەرچۆنێك ئەبێت خۆی ئەدزێتەوە ، ئەچێتە ماڵی برایم ئاغا ، خۆی فڕێ‌ئەداتە تەویلەی ولاغەکانی . میرئاخوڕ خەبەر ئەزانێ ، ئەچێ خەبەر بە ئاغا ئەدات کە پیاوێك خۆی فڕێ‌داوەتە تەویلە ، ئەمرت بەچی‌یە ؟ ئەویش ئەڵێ بچن پێی‌بڵێن بێت بۆ دیواخان ، هەرچیی لێ قەوماوە عیلاجی ئەکەم . ئەچن پێی‌ئەڵێن . عەبدوڵڵا ئەڵێت ئاغا خۆی نەیەت شەرتم لەگەڵ بکات کە عیلاجم بکات لەم تەویلە نایەمە دەرەوە . ئاغا خۆی دێت . کە تەماشا ئەکات عەبدوڵڵا چاوزەقە ، ئەڵێ ها

(٢) لە دەسنووسەکەدا «وەلی» نووسراوە بەگوێرەی شێوە نووسینی فارسی‌ئامێزی کۆن .

عەبدوڵڵا چیت لێ قەوماوە ؟ ئەڵێ ئاغا پازدە کیسەی موحەممەد پاشا قەرزارم ، ئەوا خۆی دێت بۆ سولەیمانی وە لەپێش خۆیەوە دوو سواری ناردووە بۆ ماڵی ئێمە نەوەکو من خەبەری هاتنی بزانم وە بۆ لایەك دەرباز بم . ئەمجا منیش خۆم فڕێ‌داوەتە بەر قاپیی خوا ، دووەم تۆم بەیاد کردووە . ئاغا زۆر دڵخۆشیی ئەداتەوە ، وە وەعدەی لەگەڵ ئەکات کە بە هەموو نەوعێك چارت ئەکەم . دەستی ئەگرێت ، ئەیباتە دیواخان دایئەنێت‌و زۆر ئیکرامی لەگەڵ ئەکات . وەختی نووستن دیسان بە دڵخۆشی دانەوەیێکی زۆر ڕەوانەی ماڵی خۆیانی ئەکات وە پێی‌ئەڵێت بڕۆ بۆ خدمەتی میوانەکانت ، هیچ غەم مەخۆ ، هەروەختێ موحەممەد پاشا هات چارت ئەکەم .

لەپاش چەند ڕۆژێك موحەممەد پاشا دێت بۆ سولەیمانی لای موتەسەڕڕیف[٣] . ئەشراف‌و پیاوموناسبان هەموو ئەچن بۆ بەخێرهاتنی . برایم ئاغاش ئەچێت . لە مەجلیسدا باسی عەبدوڵڵا چاوزەق دێنێتە مەیدان . برایم ئاغا عەرزی حەمەپاشا ئەکات ئەڵێت پاشا عەبدوڵڵا لەم شارەدا بە پیاوی تۆ مەشهوورە ، ئەبێت دەرحەقی عەبدوڵڵا مەرحەمەتتان بێ یا لە قەرزەکەی سەرف‌نەزەر بفەرموون وەیا تەئجیل بێ وردە وردە بۆتان ئەدا بکا . پاشا لە جوابدا ئەفەرموێ خۆتان ئەوەندە پیاو بن . برایم ئاغا (آناً) ئەمر بە مەحموود ناوی پیاوی ئەکات بچن پازدە کیسە پارە بێنن . هەر لەو مەجلیسەدا پارە دێنن . برایم ئاغا عەرزی پاشا ئەکات ئەمر

---

(٣) ئەگونجێ ئەم نیمچە ڕستەی «لای موتەسەڕڕیف»ە پێوەندی بە پێشەوە بێ ، واتە دێ بۆ سولەیمانی بۆ لای موتەسەڕڕیف ، یا بە پاشەوە ، واتە لای موتەسەڕڕیف ئەچن بۆ بەخێرهاتنی .

بفەرموون پارەکەتان وەربگرن . پیاوی برایم ئاغا پارەکە بەتەواوی تەسلیمی پیاوی پاشای[٤] ئەکات‌و عەرزیشی‌کرد[٥] : پاشام ئاوا دەستگیری لی‌ٚقەوماوان‌و هەژاری ولاٚتتان ئەکەن !

٢ – شەوێك لە عارفەی جەژنی رەمەزاندا لە ماڵی خۆیانەوە ئەچێت بۆ دیدەنیی دۆست‌و برادەرانی خۆی . لەرێگا تووشی چەند حافزی قورئان ئەبێت لی‌ٚیان ئەپرسێت مەلاینە ئۆغر بن ؟ ئەڵێن ئیمشەو عەرەفەیە ، ئەچین بۆلای ئیبراهیم ئاغای کاکەیی بۆ کاسەی جەژن . ئەویش ئەڵیٚ ئنجا عەیب‌ناکەن بەسەر ئەم هەموو موسوڵمانانەدا ئەچن بۆ لای کاکەیی ؟ لەجوابدا ئەڵێن قوربان بام کاکەیی بێت ، موویەك لە بەراز بێتەوە هەر چاکە . یەکێکی‌تریان ئەڵیٚ ماڵی کاکەیی هەرچۆنێك بیخۆی حەلاٚڵە . ئەوی‌کەیان ئەڵێت ئەچین دای باشە ، نەیدا بەدایکیەوە . لەدوای ئەم گفتوگۆیە بیٚ‌چرپە ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە . لە دیواخان دائەنیشێت . مەلاکان دێن لەخوارەوە بانگ‌ئەکەن ئاغا خوا ڕاوەستاوت کا چوار حافزین کاسەی جەژنمان نی‌یە ، لەدوای خوا قاپیی تۆمان بەیاد کردووە . ئەویش ئەمرئەکا بچنە دیواخان لای خۆی . لەدوای چەند لەتیفەو قسەی خۆش ، ئەڵێت مەلاینە لە ڕێگا تووشی کەس نەبوون گفتوگۆتان لەگەڵ‌ٚ بکات ؟ مەلاکان هەست‌ئەکەن کە ئەم دەنگە ئەوەیە کە لە ڕێگا قسەیان لەگەڵ‌ٚ کرد . یەکێکیان ئەڵیٚ ئاغا عەفومان بفەرموو . برایم ئاغا ئەڵیٚ[٦] بەو قورئانەی کە خوێندووتانە هەرچی لە ڕێگا وتووتانە

---

(٤) ئەبوو «پاشا» بووایە .

(٥) واتە : ئیبراهیم ئاغا لەگەڵ‌ٚ پارەدانەوەکەدا عەرزی محەمەد پاشای کرد . .

(٦) لە دەسنووسەکەی زێوەردا ئەم «ئەڵیٚ»یە پەڕیوە .

بۆم نەگێڕنەوە بەمەحرووومی ئەتانگێڕمەوە . ناعیلاج قسەکانیان تەکرارئەکەنەوە کە لە ڕێگا بە ئاغایان گوتبوو . لەدوای ئەوە ئەمر ئەکا هەریەکی دە ڕبە گەندم ، دوو ڕبە برنج ، دوو حۆقە ڕۆن ، سەد قران پارەیان بدەنێ .

٣ – ڕۆژێ لە ماڵی خۆیانەوە ئەچێت بۆ سەرای حوکوومەت بەسواری . خدمەتکاری زۆری لەخدمەتا ئەبێ . لەناو بازارا لەپڕ کوڕێ جڵەوی ولاغەکەی ئەگرێت ئەڵێ تۆی ئیبراهیم ئاغا ؟ ئەڵێ بەڵێ . ئیتر لە دایكو باوكو خوشكو کچو کوڕ یەوە پیا ئەڕوا بە جوێن دان . خدمەتکار بۆی ئەچن ، نایەڵێ . کە لە جوێن‌دان بوەوە وتی ڕۆڵە لەلایەن منو خزمی منەوە یا خدمەتکارمەوە تووشی زیانێ بووی ؟ کوڕەکە حاشای کرد کە هیچ زیانێکی لەتەرەف ئێوەوە[٧] نەدیوە . ئەمجا ئاغا گوتی ئەی بۆچ بە ناحەق ئەم جوێنانەت بە من دا ؟ وتی من پیاوی فلاّن ئاغام . شەو ڕووی‌کردە هەموو خدمەتکارانی وتی کامتان ئەتوانن برایم ئاغام بۆ بشکێنن ؟ من تەعەهھودم‌کرد کە بیکەم . برایم ئاغاش وتی تۆ دەرحەق ئاغای خۆت خدمەتکارێکی ڕاستی . لازمە خەلاّت بکرێیت[٨] . ئەمر بە پیاوی خۆی ئەکات ئەم کوڕە بەرن سەرتاپا جلوبەرگی بۆ بکەنو پێنج‌سەد قرانیشی بدەنێ .

٤ – ساڵێك لە عەشیرەتی دزەیی ئاغایەك ئیجارە ئەکات تووشی زیانێکی زۆر ئەبێت . وەختێ حوکوومەت تەنگەتاوی ئەکات بۆ پارە ، لە شوهرەتی پیاوەتیی برایم ئاغا خۆیو برایەکیو[٩] دوو خدمەتکار دێن بۆ

(٧) ئەبوو یا بیوتایە «ئەوانەوە» ، یا لەجیاتیی «زیانێکی» «زیانێکم» بووایە .

(٨) لە دەسنووسەکەدا «بکریت» نووسراوە .

(٩) لە دەسنووسەکەدا «برایەکی» نووسراوە بێ «و»ەکە .

سوله‌یمانی له ماڵی برایم ئاغا میوان ئه‌بن . ڕێکه‌وتی وه‌ختی مه‌غریب ئه‌کا ، دائه‌به‌زن ، وڵاغیان لێ وه‌رئه‌گرن . ڕووئه‌که‌نه دیواخان . سه‌لام ئه‌که‌ن ، جوابی سه‌لامیان ئه‌درێته‌وه ، ئیکرامیان ئه‌گرن . که دانیشتن مه‌سینه‌و له‌گه‌ن دێنن بۆ ده‌س‌شتن[10] ، میوانه‌کان ده‌س ناشۆن . دووباره ته‌کلیفیان لێ ئه‌که‌ن ، ئه‌ڵێن ئاغا نانت ناخۆین . ئه‌ڵێت بۆچی نانم ناخۆن ؟ ئه‌ڵێت تۆ پیاوێکی ئاوانته‌چی‌و ناڕاستی . ئه‌ڵێ خوانه‌که‌رده له‌گه‌ڵ ئێوه چ‌ناڕاستیم بووه ؟ ئه‌ڵێن له وه‌ختی خۆیدا پانزه کیسه پاره‌ت له باوکی ئێمه قه‌رزکردووه به وه‌عده‌ی چه‌ند مانگێك . ئه‌مه حه‌وت ساڵه نه‌تداوه‌ته‌وه . ئێستا ئێمه ئه‌مه‌نده ڕێگایه هاتووین بۆ ئه‌م پاره‌یه . تا پاره‌که‌مان ته‌سلیم نه‌بێ نانت[11] ناخۆین . ئاغاش میقدارێ ته‌حه‌ممول ئه‌کات ، ئه‌ڵێت عه‌فوم بفه‌رموون . ته‌ئخیری پاره‌که‌تان له‌به‌ر ناڕاستی نه‌بوه ، له‌به‌ر مه‌شغووڵیه‌تی دنیا بووه . نانتان بخۆن پاره‌که‌تان حازره . نه‌خێر نان ناخوێن . ناچار ئه‌مر به وه‌کیلی ئه‌کات پازده کیسه پاره دێنن ته‌سلیمیان ئه‌که‌ن ، ئینجا نانیان ده‌رخوارد ئه‌دا . له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌یشدا خه‌ڵاتێکی موناسبیشیان ئه‌کات . بۆ به‌یانی ئه‌گه‌ڕێنه‌وه .

له‌پاش چه‌ند ساڵ هه‌مان میوان دێنه‌وه . بارێك چه‌کمه‌ی مووسڵ به ئێسترێکه‌وه ئه‌یهێنن[12] به‌دیاری‌و پاره‌که‌ش ئه‌هێننه‌وه . شه‌و له دیواخان به ئیبراهیم ئاغا ئه‌ڵێن ئاغا ئه‌مانناسی ؟ ئه‌ڵێ نه‌ . ئه‌ڵێن ئێمه ئه‌و پیاوانه‌ین که فلان وه‌خت هاتین ئیفتیرایه‌کی‌وامان به تۆ کرد . پازده کیسه پاره‌مان لێ

---

(١٠) له ده‌سنووسه‌که‌دا «شوتن» نووسراوه .

(١١) له ده‌سنووسه‌که‌دا لێره‌دا «نان»ێك هه‌بوو ، به زیادم زانی ، لام‌برد .

(١٢) ئه‌بوو «ئه‌هێنن» بووایه ، یا له‌پێش «بارێك»ه‌وه «له‌گه‌ڵ»ێك بووایه .

سەندی . ئێمە ئەورۆژە وەختمان زۆر سەخڵەت بوو ، جەنابیشتان زۆر شوهرەتی سەخاو پیاوەتیتان ئەگێڕرایەوە . تۆمان بەیادکرد . گوتمان ئەگەر ئەم شوهرەتە ڕاست بێ ئەم پارەیەمان ئەداتێو لەواقیعا ڕاست بوو . خوا ماڵت ئاوا کات ئێمەی[١٣] لە بێحورمەتی نەجاتدا . ئەوا پارەکەمان هێناوەتەوە ، وە بارێك چەکمەی مووسڵ کە بەو ئێسترەوەیە دیاریی جەنابتانە . ئاغا ئەڵێت یاخوا بەخێر بێن . ئەو پارەیە یەك دەفعە لە کیسەی من دەرچووە نابێ بێتەوە کیسەی من . ئەمما لەبەر خاتری ئێوە دیارییەکەتان لێ قوبوول ئەکەم . نەتیجە پارەکەی هەر قوبوول نەکردەوە .

٥ – جارێك دۆستو ڕەفیقی نەسیحەتی ئەکەن ئەڵێن ساحێب ئەولادی ، ئەم ماڵی خۆتە بۆچی بەمنەوعە بلاوئەکەیتەوە ؟ سەخا تا ئەم دەرەجەیە موناسب نییە . ئەڵێ بۆچی من سەخیم ؟ ئەڵێن بەڵێ . ئەڵێ من لەچاو مستەفای مامما سەخی نیم ، چونکە من بە ماڵی دنیا ئەو بە ڕۆح سەخاوەتی کردووە . لێیئەپرسن چۆن ئەبێ ؟ ئەڵێت لە زەمانی حاکمەکانی بەبە هەرکەسێك بە دەوڵەمەند مەشهوور بووبێت جەریمەیان کردووە . ئەووەختە مستەفای مامم بە دەوڵەمەند مەشهوور بووە . وەختی حوکوومەتی عەبدوڵڵا پاشا بووە . بانگی ئەکات ئەڵێت مستەفا بیستوومە دەوڵەمەندی ، بچۆ هەزار قران بێنە . ئەویش ئەچێت بە خۆیو خزمو دراوسێکانیەوە شەشسەد قران پەیدائەکات . دێتەوە بۆ لای حاکم ،

---

(١٣) واتە : ماڵەکەی تۆ ئێمەی لە بێحورمەتی ڕزگارکرد . ئەشگونجێ «ی»ی «ئێمەی»ی لەجیاتیی «ت» نووسیبێ ، وەك گەلێجار «ی» لەجیاتیی «د» ئەنووسێ ، چونکە وائەبێ «ت»یشو «د»یش بەوجۆرە دەنگە ئەخوێنرێنەوە کە ئەم «ی»ی بۆ دائەنێ .

تەماشائەکا لە مەیدانی بازاڕ سێدارەیەك هەڵخراوە ، سەیرچیی زۆر ڕاوەستاون . ئەپرسێت ئەمە چی‌یە ؟ ئەڵێن ئاغا ئەو کابرا فەرەنجی‌لەبەرە برایەکی ئەو کابرای[١٤] لەچکدارەی کوشتووە ، بە ئەمری حاکم ئەیکوژنەوە . ئەویش ئەچێت بەلای کابرای براکوژراوا بە هەر نەوعێ ئەبێ ئیقناعی ئەکات . شەش‌سەد قرانەکەی ئەداتێ ، ئەویش خوێنەخوێکەی لە کوشتن عەفوئەکات . ئەم خەبەرە ئەگاتە لای حاکم . کە مستەفا ئاغا ئەگاتە حوزوور ، ئەڵێ مستەفا ڕاستە تۆ دەوڵەمەندی ، خوت هەزار قران جەریمەت لەسەرە وە شەش‌سەد قرانیش بۆ خەڵق ئەدەی . عەرزئەکات پاشا ئەگەر موساعەدە ئەفەرموویت ڕاستیت عەرزئەکەم . ئەڵێ قسەت بکە . ئەڵێ پاشا جەریمەی خۆم هەزار قران بوو بە هەزارحاڵ شەش‌سەد قرانم پەیداکرد ، وە بۆ چوارسەدەکەی منیش ئەخنکام . بە شەش‌سەدەکە ئەومان نەجات‌دا ، بام خۆم بۆ هەزار قرانەکە ئیعدام بکرێم . یەکێك بڕوا لە دوان چاکترە . حاکم قسەکەی لا مەقبووڵ بوو . عەفوی‌کردو شاڵێکی کیشمیریشی بە خەلات ئەداتێ[١٥] .

٦ — چەند شەخسێ لە ئەهلی سولەیمانی ئیجارەو ئیلتیزامی ئەملاکی ئەمیری ئەکەن . ئیبراهیم ئاغا ئەکەن بە کەفیلی خۆیان . وەختێ حاسلات واریداتی وایان بۆ نایەتە پێش کە بتوانن زیمەتەکەی حوکوومەت بدەن . زیانیان گەیشتە سەدهەزار غورووش کە موساویی هەزار دیناری ئێستایە . حوکوومەت تەنگەتاوی کردن بۆ پارەی زیمەت ، یا پارە یا حەپس . ئیبراهیم ئاغا خەبەری زانی ، چووە سەرای حوکوومەت

---

(١٤) ئەبوو «کابرا» بووایە .

(١٥) ئەبووە «دایێ» بووایە .

عەرزی موتەسەرریفی کرد من کەفیلی ئەم پیاوانەم . موساعەدەو موهڵەتمان بدەن هەتا بەدەلی ئیجارەکە پەیدائەکەم . کە موساعەدە ئەستێنێ دەستئەکا بە موڵك فرۆشتنو پارە قەرزکردن . بەقەدەر پارەکەی حوکوومەت ئەملاكو دێهاتی ئەفرۆشێ ، بەدەلی ئیجارەکە تەسلیمئەکا ، مەیدان نادا ئەو شەخسانە حەبسبکرێن کە ئەم بووە بە کەفیلیان .

مەناقیبی ئیبراهیم ئاغا تەواو نابێ . خوا لێی خۆش بێ .

ئەمەی نووسراوە لە حەمە ئاغای کوڕەزای خۆی وەرمانگرتووە .

# شێخ مارفی قازانقایه

لە ساداتی حوسەینی ، مەردی مەیدانی مورووەت و سەخاوەت شێخ مارف کوڕی شێخ موحەممەد ئەمین ، دانیشتووی دێی قازانقایە بوو . زاتێ بوو بەسەخاو کەرەم و بەشاشەت و ڕووخۆشی و میهمان نەوازی و ئینعام و ئیحسان ، یەکە پیاوی زەمانی خۆی بوو . مەناقیبی زۆرە ، بۆنموونە چەند مەنقەبەی ئەنووسم :

١ — ڕۆژێ لە بازاری سولەیمانی لەسەر دووکانی حاجی عەزیزی قازانقایەیی دانیشتبوو ، سەڵتەیەکی تازەی دیاربەکریی لەبەردا ئەبێ کە ئەو زەمانە باوی بوو ، هەمووی بە سورمە چنرابوو ، تازە پەیدا بووبوو . پیاوێکی جاف بەلایا ڕائەبووری چاوی بە سەڵتەکە ئەکەوێ ، حەزی لێ ئەکا ، ئەچێتە بەردەمی شێخ مارف وە نایناسێ ، ئەڵێ کاکە ئەم سەڵتەیەت لەکوێ سەندووە ؟ ئەویش ئەڵێ لە شابازم کڕیوە ، دووکانەکەی لە قەیسەری یە . کابرا ئەچێ پرس ئەکا ، دووکانی شاباز ئەدۆزێتەوە پرسیاری سەڵتە ئەکا لەو نموونەیە کە چاوی پێ کەوتبوو ، نەیمابوو . دێتەوە لای شێخ مارف ئەڵێ کاکە شاباز سەڵتەی نەماوە ، لە جێگای تر لەم چەشنە شك نابەی ؟ شێخ مارف ئەڵێ زۆر حەز لەم سەڵتەیە

ئەکەی ؟ ئەڵێ بەڵێ . (فوراً) سەڵتەکەی دائەکەنێ[1] ئەیدا بە کابرای جافە ، ئەڵێ برۆ موبارەکت بێ ، هیچ پارەشی پێ مەدە . جافە هەر لەوێ سەڵتەکە لەبەرئەکاو ئەڕوا لە نرخو قیمەت ناپرسێ . کە ئەڕوا پێی ئەڵێن ئەتۆ ئەو زاتەت نەناسی ؟ وتی نەوەڵڵا ! وتیان ئەوە شێخ مارفی قازانقایە بوو . کابرا وتی کەیفی خۆیەتی ، من بە مەرامی خۆم گەیشتم . لەپاش ساڵێ جافە ماینێکی نایابی جنس بەدیاری ئەبات بۆ شێخ مارف لە قازانقایە . ئەویش دیاری یەکەی لێ قوبووڵ ئەکات ، دووبارە خەڵاتی ئەکات . لەپاش ئەوە جافە بوو بە موخلیسو خدمەتکاری شێخ مارف .

٢ – جارێك پیاوێ لە گەرمیانەوە تانجی یەکی بەدیاری بۆ دێنێ . لە بەرچاوی کابرا زۆر مەدحی تانجی یەکە ئەکا کە دڵی خۆش بێت[2] . وەختی گەڕانەوە دەستێ لیباسی نایاب لەگەڵ سەد قرانی دایە . عەرزیانکرد بۆ تانجی یەك ئەوەندە ببەخشی ، هەموو دەوڵەتی دنیا بەشت ناکا . ئەڵێ لە گەرمیانەوە بەئومێدی من ئەوەندە ڕێگایە تانجی هێناوە ، ئەبێ منیش بە دڵخۆشی ڕەوانەی بکەمەوە .

٣ – هەموو ساڵێ شێخانی[3] سولەیمانی بۆ سەیرانو تەفەڕروج ئەچوونە قازانقایە ، موددەتێك بە سەفاو خۆشی ڕایانئەبوارد . ساڵێکیان کە هاتنەوە بیست سی سەر مەڕو بەرانی قاورمەی دابوو[4] بە پیاوەکانو

---

(١) ئەبوو «دائەکەنێو» بوایە .

(٢) واتە : شێخ مارف زۆر مەدحی تانجی یەکە ئەکا . بۆیە ئەبوو لەپێش «لە بەرچاوی کابرا»وە «شێخ مارف»ێك بوایە .

(٣) لە دەسنووسەکەدا «شێخان» نووسراوە .

(٤) واتە : شێخ مارف دابووی .

تەعەللوقاتی نەقیب شێخ موستەفاو بە سەیید حەسەن‌و سەیید عومەرو باقیی شێخان .

ساڵێکیان کە ئەچن بۆ قازانقایە لە مزگەوتەکەیا [٥] هەموو مەشغووڵی سوحبەت وە شەرەشووتی‌و شەرەتریٚ ئەبن ، خدمەتکارێکی دێت سەر ئەخاتە بناگوێی‌و عەرزی ئەکا [٦] کە کورەکەت مرد . ئەویش ئەڵیٚ دەنگ‌مەکە ، کەس دەنگی لێوە نەیێت ، مەلا بانگ‌کەن بیشواو چەندکەسیٚ بچن قەبری بۆ هەڵبکەنن بینێژن . کورکەتان لەدەمەوە بێت هەرچی خراپە پێتان ئەکەم . خدمەتکار ئەڕوا . وەکوو قسەکانی ئەو ئیشی کورە مردوویان دروست‌کرد ، نەیهێشت میوانەکان پیٚ‌بزانن نەوەك لە کەیف‌و عوشرەتی خۆیان دوابکەون‌و بەجێی‌نەهێشتن ، نەچوە ماڵەوە هەتا شەو یەکیٚ بە نەقیبی گوت ، ئەوسا سەرخۆشی‌و تەعزیەیان لیٚ کرد .

جارێکیان لە وەقتی سوحبەت‌و کەیفیٚ‌کە شێخان ئەیانکرد ، خەڵقیان ئەخستە ناو حەوزەکەی مزگەوتەوە . میوانێکی کوردی هاتبوو دیارییشی بۆ هێنابوو . شێخ موستەفای نەقیب پاڵێکی پێوەنا خستیە ناو حەوزەکەوە . شێخ مارف چاوی لیٚ بوو ڕای‌کرد بە سەڵتەی سورمەو کەوای تاقەوە خۆی فڕێدایە ناو حەوزەکە هەتا کابرا دڵی نەشکیٚ‌و خەجاڵەت نەبیٚ . لە حەوزەکەدا پێی‌گوت کاکە عاجز مەبە ، نەقیب وا منیشی خستە ناو حەوزەکەوە ، لەگەڵی کرد بە یاری‌و شەرەئاو . کە هاتنەدەریٚ کەواو سەڵتەکەی داکەند دای بە کابرای کوردە ، ناردی لە ماڵەوە جلیان بۆ هێنا لەبەری‌کرد .

---

(٥) ئەشگونجیٚ مەبەستی «مزگەوتەکەدا» بیٚ .

(٦) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «عەرزئەکا» .

شێخ مارف زۆر مەراقی ڕاوی هەبوو ، خوسووس ڕاوەبەراز . بەو واسیتەوە دائیما پەنجا سەگ‌و گەماڵ‌و تووڵەو تانجیی هەبوو . سێ چوار ماڵ مسکێن تەرخان بوون خدمەتی ئەو سەگانەیان ئەکرد . مەسرەفی ئەو هەموو سەگەو ئەو ماڵانە بەقەدەر مەسرەفی دیواخانی حاتەمی مەشهوور بوو ، چونکە حاتەم ئەگەر کەسێ ڕوویبکردایە ماڵی خدمەتی ئەکرد ، ئەو مەسرەفەشی دائیمی نەبوو ، ئەم دائیما میوان ڕووی لە دەرگای ئەکرد . غەرقی ڕەحمەتی خودایی بێ .

# نەقیب شێخ مەعرووف

لە نەوەی حەزرەتی کاکئەحمەد نەقیب شێخ مەعرووف زاتێ بوو بەقیمەت ، بڵند هیممەت ، بەکەرەم ، بەسەخا ، بەمرووەت ، بەعەتا .ساڵی دووسەد عەباو سەڵتەی زیاتر ئەکرد بە خەڵات بۆ ئەوانەی روویان‌ئەکردە قاپیی ئەو . ئێوارەو بەیانیان هیچ وەختێ دیواخان[1] لە میوانی زۆر خاڵی نەبوە . جگە لە میوانی خاریج ، ئەهلی مەملەکەت ئەکسەر لە مەئموران ، لە توجار ، لە دیواخانی ئەوا نەهاریان ئەکردو خۆشی ئەوەی پێ خۆش‌بوو هەر لەگەڵیان دانیشێ ، وەئیللا بەقەدەر منالێکی یەکساڵە خواردنی نەبوو . وە غەیری خدمەتی میوانی ، بەتایبەتی بۆ مەلاو حافزی مزگەوتی گەورەو زۆر لە فەقیران‌و موحتاجان تەعام دروست‌ئەکرا ، هەرکەس ئەچوو بەشی خۆی لە مەتبەخ وەرئەگرت . بە خەڵات ، بە نەقد ، بە زەخیرە ، بە هەموو نەوعێ دەستی خەڵقی ئەگرت . لە ساڵی ١٣٢٢ی هیجری[2] مزگەوتی پشت‌ماڵی خۆیان کە مەشهوورە بە

---

(١) ئەبوو «دیواخانی» بووایە .

(٢) زێوەر خۆی لەپێشان «عەرەبی»ی نووسیوە ، پاشان بە قەڵەم فەرەنگی کردوویە بە «هیجری» .

ئەم ساڵە رێکەوتی ساڵانی ١٩٠٤ – ١٩٠٥ ئەکا .

مزگەوتی بچکۆلە لەئەساسەوە تێکی داو دەستی کرد بە تەعمیری بە خشتی سوورو گەچ کە ناوکاری دیوارەکانیشی خشتی سوور بوو ، وای لیّ کرد کە لایق بوو بە یەکەم مزگەوتی سولەیمانی حیساب بکرێت . یەکیّ لە غیرەت و سەباتی نەقیب ئەو ساڵە کە ئەو مزگەوتەی تەعمیر ئەکرد عیللەتی ڕشانەوە کەوتبوە ناو سولەیمانی . هەرکەس خۆی بە پیاوو گەورە ئەزانی لە شار فیراری کرد ڕوویان ئەکردە دێهات . ئەم (أصلاً) ترس و باکی نەبوو ، خۆی ئەهات بە ڕۆژ بەدیار وەستاو کرێکارەوە ڕائەوەستا ، مەشغووڵی ئیشی مزگەوتەکە بوو . فازیلی عیرفان لە تەئریخی تەواویی مزگەوتەکە بە عەرەبی چەند شیعرێکی نووسی ئەمەیان شیعری تەئریخەکەیە :

**عمره من بالسخا موصوف**
**تأريخه «شيخي ها معروف»**

**١٣٢٢**

بۆ لیّ قەوماوان پەناە بوو . لە حەربی گەورە کە لەشکری ڕووسییە هەموو کوردی ئێرانی تالاّن کرد وە ئەیانکوشتن ، هەرچی ئاغاو بەگزادەو ڕەعیەتی ئێران هەبوو هیجرەتیان کرد بۆ عێراق ، بیّ جێگاو مەکان بلاّوبوونەوە بە دێهاتی عێراقا . چەند ئاغایەك و میقداری پەنجاە ماڵیّ ڕەعیەت پەنایان هێنایە بەر نەقیب ، ئەویش مەردانە دێی (گەرەدیّ) کە خانووی تایبەتیی خۆی تیابوو ئەمری کرد بۆ ئاغاکەیان ئەو خانووە چۆڵ بکرێت و ڕەعیەتەکان لە (گەرەدیّ) و (کانی سارد) و (ئەحمەدئاوا) ئیسکان و دابەش کران . واریداتی ئەو موڵکانەی بۆ ئەو موهاجیرانە تەرك کرد ، هەتا شەڕ بڕایەوەو ڕوویان کردەوە ئێران دەنگیّ واریداتی لەو

دێهاتە نەسەند ، مەخسووسی ئەو موهاجیرانە بوو . جگە لە واریداتی دیٚیەکان بەخوسووسی ئینعامیشی لەگەڵ ئەکردن بۆ بەرگ‌و لیباس‌و خواردەمەنی غافڵی نەکردن .

بەهاری جوودو کەرەمی نەقیب وەها سەبزو خوڕڕەم‌و ئاودار بوو تەنها بە بەخشینی ئەسپ‌و نەقدو ئیتعامی تەعام قەناعەتی نەبوو ، موڵکیشی بەتەواوی ئەبەخشی . ئەملاکی دێی قزلەری هەمووی کردە وەقفی مزگەوتی قزلەر . دێی باشماغ کە لە ئێرانا بوو بەخشیی بە مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا عەبدوڕڕەحمانی پێنجوێنی ، هەتا لە حەیاتا بوو مەلا ئەحمەد تەسەڕڕوفی ئەو موڵکەی ئەکرد . وە لە ناحیەی سووورداش دێی تەرەمارو کانی‌چنار کە نیوەی هیی خۆی بوو وە نیوی ئاخری[۳] موڵکی ساڵح ئەفەندیی لاوە کە دراوسیٚ‌و نەدیمی مەجلیسی بوو ، نیوەکەی خۆی بەخشی بە ساڵح ئەفەندی .

یەکەیەکە بەیانی ئینعام‌و جوودی مەرحووم شێخ مارف بکەم ، ئەبێ گەنجینە کەسی‌تری تیا نەنووسرێتەوە . ئەوسافی هەمووی قابیلی نووسین نی‌یە . خوا لەژێر بەیداخی جەددی خۆیا حەشری بکا . هەر ڕۆژێك میوانی نەبوایە مات‌و عاجز لەگەڵ خدمەتکارو تەعەللوقاتی شەڕو دەعوای ئەکرد . کە میوانی ببوایە وای‌ئەزانی دنیای دراوەتیٚ . لەبەر مەساریف دائیما قەرزدار بوو . موقابیلی قەرز پسووڵەو قەبزەی ئەدا . وەختیٚ تەئدیە واقیع ئەبوو پسووڵە وەرنەئەگیرایەوە ، ساحێب پارە بەو پسوولاٚنەوە داوای پارەی ئەکرد ، (قطعیاً) لیٚلیٚ نەئەبوو ئەویشی ئەدایەوە .

---

(۳) ئەبوو بیوتایە «نیوەکەی‌تری» . (ئاخری) داڕشتنێکی عەرەبی‌یە کە ئەڵێن «ونصفه الاخر» .

لەگەڵ براکانی سەیید حەسەن‌و سەیید عومەر لوتفی زۆری هەبوو. بەهەوەس ئەچوە ماڵی یەکێکیان. لە هاتنەوەدا ئێستر، دوو سێ تەغار گەندم، تەغارێ برنجی بۆ حەواڵە ئەکردن[٤].

موڵکی مەملەحەی بەئەمانەت دا بە شێخ سەعیدی گۆگ‌تەپە، تا لە حەیاتا بوو داوای واریداتی لێ نەکرد. لەپاش وەفاتی هەردوکیان ئەولادی شێخ سەعید ئیددیعای موڵکایەتیی مەملەحەیان کرد، حەفسەخان کچی نەقیب مەجبوور بوو موراجەعەتی بە مەحکەمە کرد. لەپاش کەشاکەشی زۆرو سەرفی سەد دینار مەملەحەی لە کوڕانی شێخ سەعید سەندەوە.

---

(٤) لە دەسنووسەکەی زێوەر خۆیدا وا نووسراوە: «استر دو سە تغار گندم تغاری برنجی . . .» ئێمە وامان خوێندەوە کە لەسەرەوە هێناومانەتە سەر شێوە نووسینی نوێ.

# شێخ عەلي شێخ موحەممەد ، حیسامەددین

ئەم زاتە لە مەشایخی تەریقەی نەقشی بوو ، لەقەب‌و شوهرەتی حیسامەددین‌و مەسکەنی دێی تەوێڵە بوو . لە ڕێگای تەریقەتەوە ئەڕۆیی . نوفووزی ڕۆم‌و عەجەمی گرتبوو . لە شام‌و حەڵەب‌و ئەستانبووڵەوە بۆ فەیزو بەرەکەت خەڵق ڕوویان‌ئەکردە دەرگای ئەو . هەرچەند مەسلەکی ئیرشاد خدمەتێ گەورەیە بۆ عیباد کە لە ڕێگای خراپەوە ئەیانهێنێتە سەر ڕێگای چاک‌و پاك ، ئەمما گەنجینە ئەیەوێ بە ماڵ‌و فیداکاری کەسێ خدمەتی میللەتی کردبێ تیا بنووسرێ[1] . منیش زۆر پرسم‌کرد غەیری کەشف‌و

(١) وا ڕەساتر بوو ئەم ڕستەیە بەم‌جۆرە دابڕێژرێ : «ئەمما گەنجینە ئەیەوێ ناوی کەسێکی تیا بنووسرێ بە ماڵ‌و فیداکاری خدمەتی میللەتی کردبێ» . پیاو لەم ڕستەیەی زیوەرەوە تێ‌ئەگا لەکاتێکا کە زوربەی خەڵکی دەوروبەری بایەخیان بە کەشف‌و کەرامەت‌و خەرقی عادەت داوە ، ئەم لە هەڵسەنگاندنی ناودارانا ڕەوشتی بەرزی ڕۆژانەی لا مەبەست‌تر بووە . دیارە ئەمەش سەنگ‌و ترازوویەکی زۆر بەجێ‌یە .

کەرامەت‌و (خارق العادة) نەبێ لە ماددییات شتێکی‌وام دەس‌نەکەوت. لەوخوسووسەوە من مەعزوورم کە زۆر شتم بۆ ئەم زاتە گەورەیە نەنووسیوە.

ڕۆژێ لەگەڵ دۆستێکم قسەم لەم مەوزووعە ئەکرد ئایا لە خدمەتی شێخ حیسامەددین چی ئەزانی؟ ئەوکەسە وتی: جارێ مەعلوومە کە خانەقاکەی میهمانخانەی فەقیران‌و موریدان بووە، وە هەر مەئموورێ یا زاتێکی گەورە ڕووی کردبێتە خدمەت شێخ بە موناسبی حاڵی ئەو شەخسە خەڵاتی کردووە بە[2] بەرماڵی نایاب یا بە فەرش‌و سەججادە یا بە تەسبێح‌و گۆرەوی‌و، خدمەتی زۆر گەورەشی موافیقی حەدیسی «من شعب الایمان اماطة الاذی عن الطریق»[3]، لە دێی خەرپانی‌یەوە هەتا تەوێڵە ڕێگاو جادەی چاككردووەو، ڕێگای دەربەندیخان کە تاقە زەلامێ نەیئەتوانی پیا بڕوا، بەنەوعێ تەوسیع‌و چاکی کردووە کاروان لەم‌سەرو لەوسەرەوە بێن لە یەك ناکەون. ئەم خدمەتانە موافیقی حەدیس نیشانەی ئیمان‌و خواشناسی‌یە (أعلی الله درجته).

---

(٢) لە دەسنووسەکەدا لێرەدا «بە»یەکی زیادە هەبوو.

(٣) واتە پاككردنەوەی ڕێگاوبان لە شتێ کە ببێ بە مایەی ئازارو مەینەت بۆ ڕێبوار، لقێکە لە لقەکانی باوەڕ بە خوا.

# موحەممەد ئاغای کۆیە

حەمە ئاغا کوڕی مەحموود ئاغا لە ئەشراف‌و موعتەبەرانی شاری کۆیە بووە ، ئاوازەی مەردی‌و سەخای ئەو وەها بڵاوبووەتەوە گەیشتووەتە دەرەجەی تەواتور . لەبەرئەوە منیش ئیعتیمادم بەم تەواتورە هەبوو داخڵی (گەنجینە)م کرد . من خۆشم لە مەدحیا ئەڵێم :

**حەماغای کۆیە مەردێ بوو هونەروەر**
**تەبیعەت بەرزو خاوەن فکری ئەنوەر**
**لەبۆ میوان‌و موحتاجینی ناوشار**
**دیواخانی موهەییا بوو بەیەکجار**

مەردێ بوو رەعیەتپەروەر ، میهماننەواز ، دۆستی ئەهلی فەزلۆ عیلم . ئەگێرنەوە رۆژی هەرچەند میوان رووی بکردایە قۆناغی ، کەس پرسیاری لە میوان نەدەکرد کە لەکوێوە هاتووی ، یا بۆچی هاتووی یا بۆ کوێ ئەچیت ؟ هەرچەند دابنیشتایە ئێوارەو بەیانی خدمەتی ئەکرا . زۆر لە فەقیران بە رۆژ لە بازار کاسبییان کردووە ، شەو بۆ نووستنو خواردن ئەچوونە ئەوێ . دیواخانەکەی[1] ئوتێلێکی بێئوجرەت ، لۆقەنتەیەکی بێپارە بوو . بیستوومە سوارێکی عەشایر لەوێ میوان ئەبێ ئەسپەکەی ئەتۆپێ . ئەویش هیچ دەنگ ناکا ، وەکو رۆژان ئێوارەو بەیانی لە عەمار ئالیکی ئەسپەکەی وەرئەگرێ ئەیبا ئەیفرۆشێ . ئەوەندە ئەمێنێتەوە کە بە پارەی[2] ئالیك ئەسپێك ئەکرێتەوە .

حەمەئاغا وەکو سەماحەتی مەشهوورە ، غیرەتو شەجاعەتیشی بەرابەر سەخاوەتەکەی بوو . لە زەمانی عوسمانیدا کە هەرکەس دەستی برۆییایە[3] بەسەر کەسێکدا تالأنی ئەکرد ، غەدری لێ ئەکرد ، حوکومەت پرسیاری نەدەکرد ، عەشیرەتی شێخبزەینی تەماعیان کردبوە دێهاتی کۆیە ، بە دەستە دەستە لە ئاو ئەپەرینەوە ، ئەچوونە سەر ئەو دێهاتە فەقیرانە تالأنیان ئەکردن ، جەریمەیان ئەکردن ، ماڵیان بەدەستەوە نەدەهێشتن ، حەتتا تەجاوزاتیان هەتا ناو شاری کۆیە هاتبوو . حەمە ئاغا ئەم ئەحواڵەی پێ هەزم نەکرا ، دەستیکرد بە شەرکردن لەگەڵ عەشیرەتی شێخبزەینی . ئەهالیش هەموو چونکە مەغدوور بوون عەلاوەی لەشکری

(١) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «دیوەخانەکە» .

(٢) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «بە پارە» .

(٣) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «برۆیایە» وەك لە وتندا وا ئەوترێ .

حەمە ئاغا بوون[٤] . لەپاش چەند موسادەمەیەكو كوشتار لە هەردوولا شێخ بزەینی لووتیان هاتەوە بەر خۆیان ، ئیتر نەیانئەتوانی لە ئاو بپەڕنەوە بێن بۆ حودوودی كۆیەو ، حەمە ئاغاش برازای خۆی لە حودوودا بۆ موحافەزە دانا كە شێخ بزەینی لە ئاو نەپەڕنەوە .

لەسەر مەسئەلەیەك حوكوومەت لە بەغدا تەوقیفی كرد ، چەند ساڵ لە حەبسا مایەوە ، هەروەك دیواخانی كۆیە لە حەبسخانەش دیواخانی لێ ڕاكێشا . ژاندرمەی نۆبەتچیو مودیری حەبسخانەو زۆر لە حەبسی موستەحەق لەسەر نانو خوانی ئەو ئەژیان . چەند ئەشیا بۆ دیواخان پێویست بێ وەك مەنجەڵ ، سینی ، تەشت ، دەوری ، لەگەن ، جام ، كەوچك ، هەموو بەزیادەوە بۆ مەتبەخی حەبسخانە ئامادە كرابوو . كە لە حەبس نەجاتی بوو ئەو هەموو ئەشیاو حاجەتو لەوزایماتی مەتبەخەی تەرككرد بۆ مەتبەخچیو مودیری حەبسخانە . هەر ئەو زەمانەش قیمەتی هەزار قران زیاتر بوو .

هەر جووتیارێ یا ڕەعیەتێ كە بچوایە لای بۆ گای جووت یاریدەی ئەدا ، گاجووتی پێ ئەبەخشین[٥] . زۆر شوانكارەی بووە پرسیاری لێ نەكردوون بە ڕۆنو خوریو كاورەوە هەموویان خواردووە . ئەمما ئەگەر بە غەدر بە ناحەق گاجووتێكیان ببردایە سەد قات ئینتیقامی ئەسەند . وەكو بە ماڵ ، بە نەقد ، بە حەیوان ئینعامی بووە ، بە موڵكیش بەخشندەیی كردووە . دێی مەلاهۆمەر لە ناحیەی مەرگە كە بەخشیویە[٦] بە شیلانەیی ، ئێستاش بەدەستیانەوەیە خۆیان تەسەڕڕوفی ئەكەن .

---

(٤) واتە : ئەوانیش چوونە پاڵ لەشكرەكەی ئەو .

(٥) ئەبوو «پێ ئەبەخشی» بووایە .

(٦) لە دەسنووسەكەدا نووسراوە : «بەخشیوە» .

ئەمانەی من نووسیومن بەنەزەر پیاوەتیی ئەو قەترە بەدەریایە . من چونکە شارەزای هەمووکرداری نەبووم وکەسی واشم دەس نەکەوت شتێك لە ئەوسافی ئەوم بۆ بنووسێ ، بەم میقدارە قەناعەتم کرد . وەکو بیستوومە جێگای خاڵی نی یە . کوڕی ئەو موحەممەد زیبا[7] شوێن ئاساری باوکی کەوتووە ، بۆ مەردایەتی سەعی ئەکا . خوا تەوفیق بدا .

---

(٧) بە کاکە زیاد ناووبانگی دەرکردووە .

# قادری سەعید ئەفەندی

قادری سەعید ئەفەندی لە ئەهلی سولەیمانی مەشهووره بە قالەی ئایشەخانیٚ[1] . لە زەمانی تورکا زابت بوو . تەحسیلو[2] تەجرەبەی جوانی هەبوو . لەپاش ئیحتیلالی ئینگلیز ، لەدوای شەری گەورە هاتەوە سولەیمانی . چونکە موقتەدیرو ئیش‌زان بوو ، حوکوومەتیٚ[3] مەحەللی بە موهەندیس تەعیینی کرد بۆ سەرجادەو شەقامەکان . ئەهالی‌یش لەبەر گرانی‌و پەریٚشانی ، زۆرکەس دووکانی داخستبوو ، کاسبی پیٚ نەدەکرا ، لات‌و فەقیر کەوتبوون ، دەستمایەیان نەبوو ، وە زۆریش لە ئەسارەتی رووس یا ئینگلیز ئەهاتنەوە ، بیٚ‌ئیش‌و کار ئەسوورانەوە . کە قادر ئەفەندی چووە سەر ئیشی[4] ریٚگا چاك‌کردن ، لە هەمووولاوە خەڵق روویان تیٚ‌کرد بە کریٚکار قوبووڵیان‌بکا . ئەویش مەردانە هاتە مەیدان ، سەد کریٚکاری پیٚویست بوایە دووسەد کەسی قەیدئەکرد . زۆری وابوو

(١) قالەی ئایشەخانیٚ ، یا قالەی ئایشەخانی ، هەردوکیان ئەگونجیٚن . لە شیعری گۆراندا بە «قالەی ئایشەخان» ناوی هاتووە ، واتە بیٚ (ی)کە .

(٢) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «تەحسیلی‌و» .

(٣) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «حوکوومەت» .

(٤) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «ئیش» .

ئەیزانی لەبەر ئیحتیاجی چووە بۆ ئیش‌کردن‌و ناشتوانیٚ ئیش بکا ، ئەو نەوعانەی لای خۆی قەید ئەکرد . ڕۆژبەڕۆژ ڕۆژانەی داخڵی دەفتەر ئەکردو لە خێوەتی خوسووسیی خۆیدا نان‌وچێشتی ئەدانیٚ . دەستی‌کرد بە خدمەتیٚ کە ئاوازەی لە هەموولایەکەوە بڵاوبووەوە . خۆی بەسەر عەمەلەوە ئەگەڕا . چاوەشەکانی نەسیحەت ئەکرد کە تەزییقی کرێکاران نەکەن بۆ فرمان ، بام بە ئارەزووی خۆیان بجووڵێنەوە . بەم‌نەوعە دەوامی‌کرد . زۆر کەس بووژایەوە ، هێزیان پەیدا کرد . لە ئاخردا نەقڵی لیوای مووسڵٚ بوو . لە سولەیمانی‌یەوە دیسان زۆرکەس پەنایان بۆ ئەبرد ، ئەچوون بۆ لای ئەو . ئەویش بە فەراسەت ئەیزانی ، ئەگەر ئەوکەسە سنعەتکار بووبیٚ میقداریٚ پارەی ئەدایٚ ، ئەیناردەوە بۆ سەر ئیش‌و سنعەتی خۆی . ئەگەر بیٚ‌ئیش‌و کارو ناتەوان بوایە ڕۆژانەی بۆ مەعلووم ئەکردو کاریشی پیٚ نەدەکرد ، لە مەتبەخی خۆی ئیدارەی ئەدا . خولاسە ئەو خدمەتەی قادر ئەفەندی دەربارەی فەقیران‌و موحتاجانی کرد مەگەر هەر خودا جەزای بداتەوە . (واأسفا) لەو عومری جوانی‌یەدا بۆ بەدبەختیی کوردانی هەژار وەفاتی‌کرد . مردنی ئەو داغی نا بە دڵی هەموو پێگەیشتوانی سولەیمانیدا . غەزەتەکانی کوردی شینی ئەم نەوجوانەی[٥] ئەنووسی . شاعیران لە هەموولاوە ئەشعاری مەرسی‌یەی ئەویان بڵاوئەکردەوە[٦] . خوا چاکەی نەشارێتەوە .

---

(٥) ئەبوو بیوتایە : «غەزەتە کوردی‌یەکان ، شینی ئەم نەوجوانەیان . . تاد» .

(٦) بۆنموونە ، بڕوانەرە : دیوانی بیٚ‌کەس ، چاپی یەکەم ، بەغدا ، چاپخانەی شەفیق ١٩٧٠ ، ل ١١١-١١٢ ؛ چاپی دووەم ، بەغدا ، چاپخانەی ئەلئەدیب ١٩٨٠ ، ل ١٥٩-١٦٠ ؛ دیوانی گۆران ، بەغدا ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق ١٩٨٠ ، ل ٢١٢-٢١٣ .

## باسی چەند زاتیّ کە ئەمڕۆ لە حەیاتان[1]

### – خوا بەرقەراریان کا –

# ئەمین زەکی بەگ

لە پیّگەیشتوانی سولەیمانی مەردی زۆر بەقیمەت و گەوهەری دەریای ئینسانیەت و عاشقی عیلم و مەعریفەت ئەمین زەکی بەگە . خدمەتی ئەم زاتە بۆ میللەتی کورد بە میلیۆنیّ لیرە تەقدیر بکریّت هیّشتا کەمە . کوردیّ کە لە

(١) تا ئیّستا لەمانەی لە سەردەمی نووسینی ئەم کتیّبەدا لە ژیاندا بوون ، ئەمانەیان کۆچی دوایی‌یان کردووە : ئەمین زەکی بەگ ، میرزا تۆفیق قەزاز ، شیّخ عەلائەددینی بیارە ، شیّخ مەحموود ، شیّخ موحییددینی هەولیّر ، سەیید ئەحمەدی خانەقا ، حەفسە خانی نەقیب ، پیرەمیّرد .

گۆشەی فەرامۆشی‌یا مابووەو ئەجنەبی لە حاڵی ئەم قەومە بێ‌خەبەر بوون ، زەکی بەگ بە ڕەنجێکی دە پازدە ساڵی‌و تێکوشینێکی بێ‌ئەمسال پازدە ساڵ زیاتر هەوڵ‌و تەقەلای دا کە کورد زیندوو بکاتەوە ، لە هەر کتێبێ باسێ ، لە هەر تەئریخێ شتێکی باسی کورد بووبێ نووسیویەتەوە ، هەتا تەئریخێکی جوانی قەومی کوردی هێنایە مەیدان بە ناوی (کوردو کوردستان) بە زوبانی کوردی دایناو تەرجەمەشی کرد بە عەرەبی [۲] ، بەجارێ ۱۵ ملیۆن کوردی خستە بەرچاوی دۆست‌و بێگانە ، وەئیللا کەس حاڵی کوردی بەم‌ڕەنگە نەدەزانی .

خدمەتی ئەم زاتە هەر ئەو تەئریخە نی‌یە کە نووسیویە . ئاساری زۆری دائیر بە عەسکەری وە ئیقتیسادی مەوجوودە . لە هەموو ئومووراتا ماهیرە . لە کرداری زاهیرە . موتەعەددید دەفعە لە وەزارەتا داخڵ کراوە ، ئەویش بۆ خدمەتی وڵاتەکەی کە سولەیمانی‌یە بەخوسووسی‌و بۆ عێراق بەعومومی تێکۆشاوەو هەر ئیقتیراحێکی کردووە مەقبووڵ بووە . لیوای سولەیمانی بە واسیتەی ئیحتیلال‌و ئیختیلالی ناوخۆی پاشکەوتووی هەموو لیواکانی عێراق بوو ، کە بوو بە وەزیری مەعاریف بۆ زۆرکردنی مەکتەب لە لیوای سولەیمانی‌یا دەستی‌کرد بە سەعی‌کردن . بۆ کردنەوەی مەکتەبی موتەوەسسیتەی [۳] تەشریفی‌هێنایە سولەیمانی ، بناغەی مەکتەبی

---

(۲) ئەم کتێبە بە دوو بەرگە ، بەرگی یەکەمی بە ناوی (خلاصة تاریخ الکرد وکردستان)و بەرگی دووهەمی بە ناوی (تاریخ الدول والامارات الکردیة في العهد الاسلامي) لە لایەن موحەممەدعەلی عەونی‌یەوە ، کراوە بە عەرەبی‌و لە میسر لەچاپ‌دراوە ، یەکەمیان لە ساڵی ۱۹۳۹و دووهەمیان لە ساڵی ۱۹٤٥دا .

(۳) ئەبێ ئەو قوتابخانە ناوەندی‌یە کە ئەمین زەکی بەگ بۆ بەشداربوون لە ئاهەنگی بناغە دانانی دروست‌کردنیدا لە بەغداوە هاتووە بۆ سولەیمانی ، یەکەمین قوتابخانەی ناوەندی بووبێ لە سولەیمانیدا دروست‌کراوە .

دامەزراند ، بە دەستی خۆی چەند بەردێکی دانا . لە وەزارەتی ئەشغالٚو وەزارەتی ئیقتیسادادا هەرچی پێویست بوایە بۆ عیمرانو ئاوایی مەملەکەت ئەمری ئەدا کە بکرێت . وە لە موراجەعاتی ئەربابی ئیحتیاج کە بچوونایە خدمەتی دلٚی کەسی نەدەشکاند ، ئیشەکەی ، لە هەر دائیرەیەك بوایە ، بۆ رێكئەخست . زۆر جار بۆ تەلەبەیەك ، لەگەلٚ خۆی سواری ئۆتۆمۆبیلی کردووە بردوویەتە دائیرەی مەعاریف پیٚیانی قەیدو قوبوولٚ ئەکرد[٤] . لەو خوسووساتە کەس وەکو زەکی بەگ تیٚنەکۆشاوە ، وە بۆ خدمەتی نەقدی‌یش بەقەدەر ئیقتیداری خۆی ئیعانەی مەعاریفو مەداریس وە سائیرەی کردووە .

ئەخلاقی بلٚندی ، بەرزیی هیممەتی ، بەتەواوی نانووسرێت . عیلمی ، فەزلٚی ، هونەری ، دیانەتی لە کرداریەوە دیارە . زۆر ئەدیبو کاتبو شاعیریشە . بە زوبانی تورکیو عەرەبیو فەرانسزیو ئینگلیزیو کوردی ئاشنایە . . وە دائیما وەکو وەزیر بووە بە مەندووبیش ئینتیخاب کراوە . لە مەجلیسدا حوقووقی کوردی ئاگاهداری کردووە . (مع الأسف) لەبەر ناساغیی وجوودی ئێستا ناتوانیٚ وەزیفە ببینیٚ . نەخۆشیی ئەو نەخۆشیی هەموو کوردانە ، خوا وجوودی سەلامەت کا .

---

(٤) لە دەسنووسەکەدا ، بە شێوەی نووسینی کۆن ، وا نووسراوە . لاموایە وا جوانتر بوو بینووسیایە : «زۆر جار بووە تەلەبەیەکی لەگەلٚ خۆی سواری ئۆتۆموبیل کردووە ، بردوویەتە دائیرەی مەعاریف ، پیٚیانی قەیدو قوبوولٚ کردووە» .

# عەلی کەمال بەگ

عەلی کەمال کوڕی میرزا عەبدوڕڕەحمان ، لە مەحەلـلەی دەرگەزێن ، تەوەللودی لە سولەیمانی‌یا بووە ، تەحسیلی ئیبتیدائی‌و ئیعدادیی لە عێراقا تەواوکردووە . لەپاشا لە ئەستەنبوولْ لە مەدرەسەی حەربی‌یە تەحسیلی عالیی کردووەو داخڵی ڕیزی زابتان‌و مەسلەکی عەسکەری بووە . موددەتیْ لە خدمەتی عەسکەری بە سەداقەت‌و شەجاعەت خۆی نواندووە . لەپاش ئیحتیلالی عێراق لەتەرەف لەشکری ئینگلیزەوە ئەمیش وەك زابتانی ڕەفیقی ڕوویان‌کردەوە وەتەن[1] ، هاتەوە

(١) جوانتر بوو بیوتایە : «کە ڕوویان‌کردەوە وەتەن» .

بۆ بەغداو سولەیمانی . خوسووسیاتی ئیشی چیی کردووە ، چیی نەکردووە مەتڵەب نی یە ، وەلیٚ کە ئیقتیداری لە حوکوومەتەوە ناسرا بە مودیری پۆلیسی بەغدا تەعیینکرا . کە چووە سەر وەزیفە ئینتیزامی خستە دائیرەی شورتی یەوە ، ئینزیباتی لە شاری بەغداو ئیجرائاتی دەس پیٚ کرد . ئەو بازاڕی بەغدایە کە پڕ بوو لە دزو گیرفانبڕ ، لەترسا جیٚ نەبوو خۆیانی تیا بشارنەوە . ئەترافیشی لە جەردەو پیاوخراپ موحافەزەکرد . ئەو موددەتەی کە مودیری پۆلیس بوو ، بەغدا لە زەمانی خەلیفەکان زیاتر ئەمنیەتو ئاسایشی پەیدا کرد . خۆی (بالذات) تەبدیل ئەکرد بۆ تەعقیبی دزو ئەشقیا هەتا دەردەستی ئەکردن . موددەتیٚکیش بە مەندووبی سولەیمانی تەعیینکرا لە مەجلیسدا ، ئەوی قسەی حەق بوو سەربەست بەیانی ئەکردو بۆ حوقووقی کوردان لەگەڵ حوکوومەت کەوتە[٢] موناقەشەو گفتوگۆ . لە هەموولایەکەوە تەئییدی قسەکانی ئەکرا . ئەمما مەتالیبیٚ کە ئەو داوای ئەکرد موافیقی سیاسەتی ئیستیعمارچی نەبوو . وازیان پیٚ هیٚنا . ئەویش بە فکری بەرزی خۆی کە هەمیشە سەربەست ژیاوە ، ئەسارەتی قوبووڵ نەکردووە ، لە کاسبیو تیجارەتەوە ئالاٚ ، لە حوکوومەت بیٚتەرەف بوو . ئەمجا بە نەقدو بە بەدەن بۆ خدمەتی کوردان هاتە مەیدانەوە ، غەزەتەی (گەلاوێژ) کە لە بەغدا دەرئەچوو ، دوو ساڵ زیاتر بە پارەی خۆی موعاوەنەتی ئەکرد کە پەکی نەکەویٚ کوردان ئیستیفادە لەو ڕۆژنامەیە بکەن ، نوقسانی مەساریفی ئەو تەواوی ئەکرد . وە ئەو تەلەبەی بۆ تەحسیل کە[٣] ئەچوو بۆ بەغدا ، لە هەر مەکتەبیٚکا بوویٚ بیٚئیدارەو گوزەران ، لەتەرەف عەلی کەمالەوە

(٢) ئەبوو «ئەکەوتە» بووایە .

(٣) ئەم «کە»یە پیٚویست نی یە .

مەعاشی بۆ مەعلووم ئەکرا ، هەتا تەحسیلی بەغدای تەواو ئەبوو ئەو مەعاشەیان هەبوو . ئەوەیش مەخسووسی تەلەبەی سولەیمانی نەبوو ، مادام کورد بوایە ئەو موساعەدەی ئەکرا ، مانگی سەد دینار زیاتر سەرفی ئەو نەوعانە ئەبوو کە فەقیرو بیٚ کەس بوون .

سەخای عەلی کەمال وەك ئۆکتای قائان تەبیعی و عوموومی یە . لە هەرلایەك ئیحتیفالیٚ بۆ ئیعانە بکریٚت ، حازری مەجلیسیش نەبیٚ ، میقداری عەتای ئەو لە بانگ‌کراوەکان زیاتر بووە [٤] . لە تەئسیری شەڕی ئەورووپا عالەم فەقیرو سەرگەردان کەوتن . لە سولەیمانی قەراریان‌دا فەقیرخانە دابنیٚن ، هەرچی کویٚرو پیرو ژنو منالّی بیٚ کەس هەیە لە فەقیرخانە کۆبکریٚنەوە خواردنو بەرگو لەوازیماتیان تەئمین بکەن . لەو ئیحتیفالەدا ئەشراف وە توججارو مەئموور هەرکەس بەقەدەر هیممەتی خۆی ئیعانەیان دا ، میقداریٚکی وا پارە کۆبووەوە کە بتوانن فەقیرخانەی پیٚ تەشکیل بکریٚت [٥] ، وە بۆ دەوامی ئەم خیٚرە هەرکەس ناوی خۆی نووسی کە مانگانە مانگی میقداریٚ بدا . عەلی کەمال لە بەغداوە جاریٚ بۆ ئیعانەکە پیٚنج‌سەد دیناری حەوالّە کرد ، وە بۆ مانگانەش [٦] هەتا شەڕی ئەورووپا دەوام بکا مانگی پەنجا دینار بدا بە فەقیرخانە . حەقیقەت هەتا ئاخری حەرب ئەم ئیعانەیە مونتەزەم مانگ بە مانگ تەسلیمی مەئموورانی فەقیرخانە ئەکرا .

---

(٤) ئەبوو «زیاترە» بووایە .

(٥) یا ئەبوو لەجیاتیی ئەم «بکریٚت»ە بلّیٚ «بکەن» ، یا لەجیاتیی «بتوانن»ەکەی پیٚشەوە بلّیٚ «بتوانریٚ» .

(٦) ئەبوو لیٚرەدا «بڕیاری‌دا» یا شتیٚکی وا بووایە .

له بەغدا کە تەشکیلی حیزب کرا[7] ، هەموو حیزبەکان تەڵەبیان کرد کە میللەت لە ئینتیخابی مەندووبدا سەربەست بن ، حوکوومەت موداخەلە نەکا . ئەمجارە عەلی کەمال بە خەیاڵی خدمەتی گەورە بۆ میللەت خۆی بۆ مەندووبی تەرشیح کرد وە سەد لیرەش دیپۆزیتۆی[8] لە سندووقی حوکوومەتا دانا کە ئەمر وەها بوو[9] . هاتەوە سولەیمانی . ئینتیخابات دەس پێ کرا . ئەهالی‌یش لەسەداسەد تەرەفداری عەلی کەمال بەگ بوو[10] کە ئینتیخاب بکرێت ، ئەمما سیاسەت مانیعی ئینتیخابی ئەو بوو[11] ، لەبەر دەفعی فیتنە لەبەینی حوکوومەت و ئەهالیدا وازی لە

(٧) دیارە ئەبێ مەبەستی زێوەر ئەوکاتە بێ کە پاش برانەوەی شەڕی دووەمی جیهان کۆڕو کۆمەڵە نیشتمان پەروەرەکانی عێراق لە ١٩٤٦دا داوای چاککردنی بارو دۆخی سیاسی ولاتیان کردو روخسەتیان بۆ پێکەوەنانی چەند حیزبی سیاسی لە دەوڵەت خواست و رێگای هەندێکیان درا .

(٨) دیپۆزیتۆ : تەئمینات ، بارمتە .

(٩) قانوونی ئەو سەردەمە وابوو ئەوەی خۆی دیاری بکردایە بۆ نوێنەرایەتیی پەرلەمان ئەبوو سەد دیناری بارمتە لای دەوڵەت دانایە . ئەگەر سەرکەوت لە هەڵبژاردنا ، ئەیاندایەوەو ، ئەگەر دۆراندی پارەکەشی ئەفەوتا . ئەم بارمتەدانانە یەکێك بوو لەو فێڵانەی بۆ دوورخستنەوەی نوێنەرانی چینە هەژارەکان لە خۆ دیاریکردن بۆ بوون بە نوێنەری گەل ، بەکارئەهێنران .

(١٠) ئەبوو «بوون» بوایە .

(١١) ئەمە لە هەڵبژاردنەکەی ١٩٤٧دا بوو . لە هەڵبژاردنی ١٩٤٨و هەڵبژاردنەکانی پاشەوەدا تێکرا عەلی کەمال یەکێ لە نوێنەرانی لیوای سولەیمانی بووە ، تەنانەت ئەگەر گەلیش ویستبێتی کەسێکی تر هەڵبژێرێ ، وەك لە هەڵبژاردنی یەکەمی ١٩٥٤دا رووی‌دا . هەردوو بەیان‌نامەکەی عەلی کەمال لەبارەی خۆ دەس‌نیشان کردنەوە بۆ نوێنەرایەتی و کشانەوەوە لەو خۆ دەس‌نیشانکردنە ، لە ژمارە ٣ی ساڵی ٨ ، مارتی ١٩٤٧ی گۆڤاری «گەلاوێژ»دا بلاوکراونەتەوە .

مەندووبی هێناو سەد دیناری ڕەهنەکەشی بۆ فەقیرانی مەکتەبەکان تەبەڕڕوع کرد . ئەم حەرەکەتەشی زۆر مەردانەو وەتەنپەروەرانە بوو ، وەئیللا وازی نەهێنایە یەك دەفعە سەورەیەك پەیدائەبوو سەد کەس زیاتر بکوژرایە .

لە خدمەتکارانو ئەمینداری[١٢] عەلی ڕۆستەم ناو میقداری سەد دینار زیاتر قەرزدار ئەبێ . کە وەفاتی‌کرد لەگەڵ ئەوەش فەقیر نەبوو سەروەتو ماڵی هەبوو ، لەو قەرزە ئازادی کرد ، تەڵەبی لە واریسانی نەکرد . ئەم ئیحساناتەی کە بەڕووەوەیەو ئاشکرایە خەڵق ئەیزانێ ، نووسراوە ، وەئیللا مومکینە بەخششی سیڕڕیو نیهانی‌یشی زیاتر بێ[١٣] .

لە ڕەددی خەرافاتی ناوعەوام ، باسی جنۆکەو خێوو غوولی بیابانو زۆر شتی‌وا کە لای عەوام ڕاستن ، نامیلکەیەکم نووسیوەو بلاوکرایەوە ، هەر نوسخەی بە ٧٠ فلس بوو ، بە زوبانی منەوە نوسخەیێکی بۆ ئەبەن ، خوا شاهیدە نە من ناردوومەو نە گوتوومە بۆی بەرن . ڕۆژێ لە ماڵەوە دانیشتبووم بە خزمێکی خۆیدا دە دیناری ناردبوو . منیش کەوتمە تەردیدەوە قوبووڵی بکەم یا نەیکەم . لێکم دایەوە[١٤] لە قوبوول نەکردنا دڵی عاجز ئەبێ ، مەجبوور بەیانی تەشەککورم کرد ، وەرم‌گرت .

موفرەداتی جوودو کەرەمی بە نووسین تەواو نابێ . بەم چەند شیعرە ئەوسافی بەیان ئەکەم :

---

(١٢) ئەبوو «ئەمیندارانی» بووایە .

(١٣) بەش‌بەحاڵی ئەم سەردەمەش ئەبێ بە قەدرلێ زانینەوە باسی ئەوەی بکرێ کە پارەیەکی باشی بۆ کردنەوەی نەخۆشخانەیەكو شانۆیەك لە سولەیمانی تەرخان کردووە .

(١٤) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «لێکم دایە» .

مەداری فەخری هەموو کوردو میللەتی مەدەنی
عەلی کەمال بەگە ئیسباتی کردووە عەلەنی
حەلاوەتی قسەوو گفتو لوتفی شیرینی
شکستی داوە بە هەنگوین و کاڵەکی مەرەنی
چفەرقی لا نی‌یە وەقتی کەرەم عەلی‌یو عومەر
موساوی‌یە لە نەزەریا حوسەینی‌یو حەسەنی
بە هێزی هیممەتی بۆ هاوولاتی کۆشش ئەکا
ئەمە بەڕاستی خدمەت بکا لە بۆ وەتەنی
شەفیعی جاەو مەقاماتی غەوسەکەی بەغدا
ڕجایی عومری درێژیشی وەیسەکەی قەرەنی

# میرزا تۆفیق قەزاز

لە مەردانی مەشهووری سولەیمانی میرزا تۆفیق کوڕی حاجی ئەحمەدی مەشهوور بە تۆفیق قەزاز ، بە ناوی باوکیەوە کە قەزازیی ئەزانی ، ئەمیش بەو لەقەبەوە نیسبەت دراوە . بە بێ تەحسیلی عالی لە فەننی ئیدارە وە سیاست و ئیعمار و ئیقتیساد گرەوی لە تەحسیل دیدەکان[1] بردووەتەوە . بە سەماحەت ، بە جەسارەت ، بە غیرەت هاوتای لە سولەیمانی یا نی یە .

(۱) لەوانەشە مەبەست (تەحسیل دیدەگان) بێ کە وشەیەکی فارسی یە لە ئەدەبی کوردیی کۆندا بەکارهاتووەو هەمان واتای (تەحسیل دیدەکان)ی هەیە .

ڕیایی ، مەرایی ، پۆلیتیقەی[٢] مەئموورێی گەورەی بە کوفر دەزانی . بە ئاساری عیمران شیعاری ئەجنەبی‌و خۆولاتیی مەمنوون کردووە . بچۆرە سەرچنار کە قەبرستانێکی وشك‌و بێ‌سێبەر بوو ، ئێستا بە فکری عیمرانپەروەری وای لێ‌کردووە (جنة تجري من تحتها الانهار) . کردوویە بە پارچە بەهەشتێ کە قابیلە شاەو گەدا بۆ تەفەڕڕوج‌و سەیران ڕووی تێ‌بکەن ، یا بچۆ بۆ سەراوی سوبحان ئاغا لە شارەزوور ، موتەحەییرانە بانگ‌ئەکەی (سبحان من تحير في صنعه العقول) . ئەو مەعدەنی مارو مێروولەو مێشوولەیە بووە بە باغ ، بە دارستان ، بە زەراعەت ، نموونەی سەیفی‌یەکانی[٣] ئیسویچرە[٤] وە شاخی لوبنان . وەرەوە سولەیمانی ، قەسرێکی بۆ دانیشتنی خۆی دروست‌کردووە عەرەب چاوی پێ‌بکەوێ ئەڵێ :

**فلا يدخلك ، يا قصر ، أنين**
**وأضحى فيك مسرورا ، حزين**

بێینەوە سەر مەتڵەب . عەجەبا ئەم سەرچنارە ، ئەم سەراوی سوبحان ئاغایە ، ئەم خانوو و قەسری سولەیمانی‌یە چۆن دروست کراوە ؟ بە بێگارو هەرەوەز ، یا بە هێزی پارەو خدمەتی عەمەلە ؟ بەڵێ ، بە سەرفی پارە پەیدابووە . (تقريباً) هەتا ئێستا وە بۆ ئەو بینایەی کە تازە خەریکیەتی

(٢) پۆلیتیقە : یا پەلاتیقە ، هەرچەند لە ئەسڵە لاتینی‌یەکەیدا بەمەعنای (سیاسەت)ە ، بەڵام کە لە ڕێگای تورکی‌یەوە هاتوەتە ناو زمانی کوردی‌یەوە بەمەعنای هەوڵ‌و تەقەلای زیاد بەکاردێ .

(٣) سەیفی‌یە : صیفیة ، هاوینەهەوار .

(٤) ئیسویچرە : سویسرا .

لەسەر جادەی کەرکووك سەدهەزار دینار سەرف بووە یا ئەبێ . ئەم هەموو دینارە چیی لێ هات ؟ هەمووی چووە باخەڵی کرێکارو جووتیارو سەپان‌و عەمەلەو وەستاو ساحێب‌گەچ‌و بەردو قسڵ‌و خشتی سوور . بام بە ناوی مەنفەعەت بێ بۆ خۆی ، ئەمما ئیستیفادەی میللەت زۆرترە کە ئەو هەموو نەقدەیان دەست‌کەوتووەو ولاتەکەشیان جوانی‌و زینەتی تێ کەوتووە . میرزایش وەك ئەوان ئیستیفادە لە سەیرو تەماشا دەکا ، وەئیللا ئەو مەسرەفەی کردوویەتی خوا ئەیزانێ بە چەند ساڵ پڕئەبێتەوە .

خدمەتێکی تری : خەبەر بە ئەهالیی شارەزوور ئەدا کە بێنەوە ڕاوە بەرازە ، پێنج شەش سەر مەڕ سەرئەبڕێ ئەیکا بە زیافەت بە پلاوو گۆشت بۆ ئەوانەی کە بۆ ڕاوە بەراز کۆئەبێتەوە[٥] . بەجارێ وەك شکاری شاهی ، لە هەموولایەکەوە ئەهالی ئەکەونە ئەو چەم‌و دەشتەوە ، بەراز ڕائەپەڕێنن ، بە سەگ ، بە تفەنگ دەست‌ئەکەن بە کوشتاری بەراز . لەپاش ئەم ڕاوو شکارەو دەفعی بەراز لەو ئەترافەدا ، ئەهالی بە کۆمەڵ ڕووئەکەنەوە دیواخانی میرزا تۆفیق‌و بە قسەو باسی ڕاوەکە هەرکەسێ شتێکی دیبێ ئەیڵێت . ئەمجا سینی‌و خوانیان بۆ دێتە پێشەوە ، بە دڵی خۆش بەئارام قاوەڵتی ئەکەن . لە ئاخردا سەماوەریان بۆ گەرم ئەکرێت ، چا ئەخۆنەوە . بەم خدمەتە هەم دەفعی بەرازی کرد ، وە هەم ئەهالی‌یشی بە دەعوەت‌و نان‌خواردن لەگەڵ یەك‌و مەحەببەت‌و دۆستی ئاشنا ئەکرد .

خدمەتێکی تری ، لە واقیعەی بەردەرگای سەرای حوکوومەت : ئەوسا هەموو لیوایەك موعاوینێکی ئیداریی ئینگلیزی تیابوو . حوکوومەت ئەیویست خۆی بە بێ‌ئەهالی ئینتیخابی مەندووب بکا . ئەهالی‌یش ئەوەیان

(٥) ئەبوو «کۆئەبنەوە» بووایە .

لا ناخۆش بوو ، ئینتیخابی حوڕو قانوونی یان ئەویست . بۆ ئەو مەسئەلە موزاهەرەیێکی قانوونی کرا ، میرزا تۆفیقیان کرد بە وەکیل کە مەتالیب بە حوکوومەت تەبلیغ بکا . میرزا چووە بانی چاخانەی پێش سەرا ، ڕێگا نەبوو بۆ دائیرەی موتەسەڕڕیف ، دەرگای حوکوومەت سەد کرابوو و پۆلیس بە سیلاحەوە موحافەزەیان ئەکرد . لە دائیرەی موتەسەڕڕیفدا ئینتیخاب ئەکرا . لە سەربانی چاخانەکە میرزا دەستی‌کرد بە نوتق‌دان‌و تەڵەبی مەتالیبی میللەتی کرد . بەعزێ لە جاهیلان‌و هەرزەکاران غیرەتیان هاتەجۆش پەلاماری پۆلیس‌و دەرگای حوکوومەتیان دا بە بەردەباران . حاکمە ئینگلیزەکە ناردی مەفرەزەیەك عەسکەر بە مەترالیۆزەوە هات‌و ئەمریشی‌دا کە تەعەڕڕوزی ئەهالی بکەن . عەسکەر دەستی‌کرد بە ئاگربارانی مەترالیۆز ، بە جارێ سەد بریندارو کوژراو لە مەیدانا کەوت . ئەهالی چونکە فکری موقابەلەی حوکوومەتیان نەبوو . کەس سیلاحی پێ نەبوو ، بە ناچار بڵاوبوونەوەو چەندکەسیش لە ئەهالی گیراو تەوقیف کرا . میرزا تۆفیقیش لە تەوقیف‌کراوەکان بوو[٦] . وە لە مەوقووفان قیسمی ئەشرافیان نارد بۆ کەرکووك . باقی لە سولەیمانی حەبس‌کران . حوکوومەت بە مەرامی خۆی ئینتیخابی مەبعووسی کرد . لەپاش موددەتێ کە نەجاتیان بوو میرزا تۆفیق دەستی سەماحەت‌و مەردایەتیی بۆ ماڵ‌و منالی کوژراوەکان درێژکرد ، مەعاشی بۆ بڕینەوە ، مانگەو مانگ یاریەی ئەدان‌و[٧] خدمەتی ئەکردن . هەتا ئەم ئاخری‌یەش زۆر عائیلەی موستەحەق ئەو مەعاشەی وەرگرتووە ، وە ئێستاش جەژنان مەسرەفی جەژن‌و خەرجی‌یان

---

(٦) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «بوون» .

(٧) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «ئەداو» .

بۆ ئەنێرێ . لە دەوڵەمەندان زۆر کەس ڕەفیق بوو . تەنها میرزا ئەم خدمەتەی بە میللەتی پەرێشان کرد .

یەکێکی تر : هەموو ساڵێ بە ناوی زەکاتەوە میقداری چوارسەد پێنج سەد دینار دادەنێ . ئیحتیمال لەوقەدەرەش گەلێ زیاتر بێ ، ئەوە خۆی ئەیزانێ . خەبەر بە کوێرو پیرو هەژارو لێقەوماوان ئەدرێت کە بچن (حق الله) وەربگرن ، دەستە دەستە فەقیرو هەژار ، ژن و پیاو ڕووئەکەنە مەحەللێ کە بۆیان مەعلووم کراوە ، هەرکەس بەگوێرەی ئیستیحقاقی خۆی پارەی ئەدرێتێ . وەك زەکاتی سائیرە نی یە کە یەکی پەنجا فلس یا سەد فلسی ئەدەنێ و دەفعی ئەکەن لە خۆیان . ئەم لە دینارەوە هەتا سێ چوار دیناریشیان ئەداتێ[٨] کە کەڵکی ئیحتیاجی یان بگرێت .

شەخسێ گێڕایەوە وتی لەسەر خەرمانی مەرەزەکەی دانیشتبووم لە هەموولاوە بۆ خەرمانلۆغە فەقیر ڕوویان تێ کرد ، هەرکەس بەقەدەر خۆی بێبەش نەکرا . چەڵتووکیان ئەدانێ ، سەیرم کرد سەیدێکی شاڵ سەوز پەیدابوو ، داوای خەرمانلۆغەی کرد . میرزا لێی پرسی سەیید لەکوێوە هاتووی ؟ وتی لە دێی گوڵپەوە . ئەمری کرد پێنج تەنەکە چەڵتووکیان بۆ پێوا . سەیید هەرلەوێ سێ تەنەکەی فرۆشتەوە . دوو تەنەکەشی کردە گونیەوە دای بە شانیا . بانگی سەییدی کرد[٩] وەرە ! سەیید هات . گوتی کاکە سەیید ناتوانی بەمکۆڵەوە بگەیتە گوڵپ . پسووڵەیەکت بۆ ئەنووسم هەر ئۆتۆمۆبیلێ هات نیشانی بدە هەڵت ئەگرێت

(٨) لە دەسنووسەکەدا : نووسراوە : «ئەدەنێ» .

(٩) ئەبوو لێرەدا ناوی میرزا تۆفیق بهاتایە .

بۆ هەڵەبجە . ها ئەوە دوو دیناریش بۆ خۆت خەرجی[10] کە . سەیید بەمەسرووری ڕۆی . ئۆتۆمۆبیلی تووش‌بوو هەتا هەڵەبجە بە خۆی‌و چەڵتووکیەوە بەخۆڕایی هەڵیانگرت .

سێ کوچکەی مەردی کە لە قەرەداغ‌و سەرچنارو شارەزووردایە مەنجەڵی سەماحەتی خستووەتە سەر ، هاتووەتە جۆش ، لە هەموو ئەتراف‌و جانیبێکدا ئیستیفادە لەو مەنجەڵە بەجۆشە ئەکەن . دوورو نزیك خێری بەئوجرەت بێ ، بەخۆڕایی بێ ، لێ وەرئەگرن . هەموو جێگایێك کە قەڵەمڕەوی ئەو بێ دوعای خێری بۆ ئەکەن . خودا دوعایان قوبووڵ کات .

---

(١٠) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە «خەرج» .

# شێخ عەلائەددینی بیارە

لە شێخانی تەریقەتی نەقشی شێخ عەلائەددین کوڕی شێخ عومەر زیائەددین زاتێکە زۆر ڕووخۆش ، بەتاعەت ، بەخدمەت . بە ماڵو بە بەدەن دائیما بۆ خدمەتی میللەت ئامادەیە . خانەقاکەی لە هەموو وەقتێکا بێ سۆفی و موریدی غەریب نی یەو میوانی تایبەتی یش لە مەئموورانو لە پیاوی گەورە ڕووی تێ ئەکەن ، هەرکەس موناسبی حاڵی خۆی خدمەتی ئەکرێت . ئەگەر کەسێ پرسیار بکا هەموو تەکیەو خانەقای کوردستان ئەم نانو شۆربایەی هەیە ، بەتەنها بۆ شێخ عەلائەددین خراوەتە (گەنجینەی مەردان)ەوە ؟ لەبەر چەند کردەوەی جوانیە کە لە ڕێگای ئینسانی یەتو دیانەتا کردوویەو ئەیکا .

یەکەم : لە وەقتی گرانی یەکەدا کە ماڵی لە مەریوان بوو ، بەوە دڵی ئاوی نەدەخواردەوە هەرکەس بێتە خانەقا نانو شۆربای باتیٚ ، بەڵکو هەموو ڕۆژ زەلامی بە کوڵەنانەوە ئەنارده سەر ڕێگاکان ، دوور لە ئاوەدانی ، لە ڕێگا رادەوەستا بۆ کەسێکی لیٚقەوماو کە لەبەر برسیەتی نەتوانیٚ بگاتە ئاوایی ، یا بۆ دیٚیەکی‌تر بڕوا پەکی‌کەوتبیٚ ، کولێرەو نانی بدەنیٚ هێز پەیدابکا بۆ ڕۆیشتن بۆ ئەو جێگای بۆی ئەچیٚ .

دووەم : بەواسیتەی ئەوە کە لە حەکیمیدا دەستی هەیەو ئەنواعی دەرمانو دەوای هەیە زیاتر لە مریدو سۆفی ، نەخۆشو بریندارو دەردەدارو چاوئێشاو ڕووئەکەنە خانەقا . ئەمانە هەتا ئەڕۆن هەم خواردنیان ئەدەنیٚ وە هەم تەداوی‌یان ئەکرێت .

سیٚیەم : خانەقا وەك جێگای عیبادەتە وەك زەمانی شێخ زیائەددین ، بووە بە مەدرەسەی عیلمی‌یەش . مودەڕڕیسی چاکی هەیە ، دائیما دە پازدە موستەعیدو سوختەو فەقیە لەوێدا تەحسیل‌ئەکەن

مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

حەتتا ئیجازەی عیلمی یەی تێدا وەرئەگیرێ ، چونکە مودەڕڕیسەکەیان مەلا عەبدولکەریم عالمێکی فازیلو داناو بە عولوومی عەسری یەش شارەزایە . ڕۆژێ چوومە سەیری تەدریسو تەقریری ، سەیرمکرد میقداری دە موستەعید بەریز دانیشتوون ، بەحەڵقە دەرسیان ئەخوێند ، یا (بەیزاوی)[1] بوو دەرسەکەیان یا (ئیبنوحەجەر)[2] ، لە خەیاڵم نەماوە . ئەو موستەعیددانە بە کەمالی تەربی یە گوێیان لە تەقریر ڕاگرتبوو . ئەگەر یەکێکیان ئیشکالێکی بوایە مەلا جوابی ئەدایەوە . لەپاش دەرس لە خدمەت مەلا دانیشتم . وەزعی ئیدارەو ئیعاشەی مەلاو تەلەبەم پرسیارکرد ، ئەویش بە شوکرانەی زۆرەوە بەیانی خدمەتی شێخ عەلائەددینی کرد ، گوتی مەساریفی هەموو تەلەبەو مودەڕڕیسو ئیمامو موئەززینو خادیم لە تەرەف شێخەوە تەئمین کراوە ، نوقسانیمان نی یە .

وە غەیری ئەم سیفەتانەی ئەگەر شێخ کەسێ موراجەعەتی پێ بکا کە لای مەئموران ڕجای بۆ بکا ، میرزاو کاتبی هەیە دەستبەجێ موافیق مەتڵووبی ئەو شەخسە ڕجانامە ئەنووسرێ ئیشی ڕاهی ئەکەن .

لەتیفە : ڕۆژێ موردەڕڕیس مەلا عەبدولکەریم عەرزی ئەکا ئەی شێخ ئەوکەسانەی دیاریت بە ناوی شێخیەتی یەوە بۆ دێنن ، حەرامە چۆن قوبووڵی ئەکەیت ، بەڵکو تۆ شێخێکی وا نەبی کە ئەو عەقیدەی هەیە[3] ؟ فەرمووی بە ناوی شێخیەتی یەوە دیاری وەرناگرم ، بەڵکە بە ناوی حەکیمی یەوە لێیان قوبوولْ ئەکەم .

---

(١) تەفسیرێکی قورئانی پیرۆزە .

(٢) کتێبێکی شەرعە لەسەر ڕێبازی شافیعی .

(٣) ئەبوو «ئەوان عەقیدەیان هەیە» بووایە .

(ظاهراً) شێخ عومری گەیشتووەتە هەشتاد زیاتر. خوا بۆ خدمەتی موسوڵمانان عومری درێژ کا.

# شێخ مەحموود

مەردی مەیدانی حەمی‌یەت ، شێری بێشەی حورڕی‌یەت ، لە ساداتی ڕەفیع دەرەجات شێخ مەحموود کوڕی شێخ سەعید کوڕی شێخ موحەممەد کوڕی حەزرەتی کاك ئەحمەدە . لە ساڵی ١٣٠٠ی هیجری[١] لە سولەیمانی هاتووەتە دنیاوە . عومری کە گەیشتە شەش حەوت ساڵانە لای مامۆستای خوسووسی دەرسی قورئانی کەریم و بەعزێ لە دینیەی خوێند . ئەوسا لە سولەیمانی هەر مەکتەبێك هەبوو ئەویش عەسکەری بوو . ئەهالی لە قوتابخانە بە منداڵی خۆیان ئەخوێند . خوێندنیش فارسی و

(١) ڕێکەوتی ساڵانی ١٨٨٢ – ١٨٨٣ ئەکا .

تورکی بوو . عەرەبی هەر لە مەدرەسە[2] عیلمی‌یەکاندا ئەخوێنرا . لەسەر عادەتی ئەوسا فارسی‌و تورکیی لە قوتابخانە تەواوکرد ، خەت‌و سەوادی پەیدابوو . زەمانەکە ئەوەندە پەرێشان‌و موشەووەش بوو کەس بەلای تەحسیلا نەدەچوو . نەفسی شار بێجگە لە حوکوومەت پەنجا ئاغاو ساحێب‌حوکمی تیا بوو . هەر مەحەللەیەك ، بەڵکو هەر سوقاقێك ئاغایەکی بوو . شێخ مەحموود کە چاوی کرایەوە ، کەوتە دنیاوە . حوڕڕیەتی تەبعی هەموو موعامەلەیەکی قوبووڵ نەدەکرد ، دەستی‌کرد بە موقابەلەی ئاغایانی ناوشارو حیمایەی مەغدوورو بێچارە . وردە وردە ئەهالی ڕوویان‌کردە پەناو دەرگای ئەو . لەپاش یەك دوو ساڵ هەموو مەحەللەی کانیی ئاسکان‌و مەڵکەندی‌و سەرشەقام‌و قیسمێ لە گۆیژەو دەرگەزێن بوون بە مەحسووب‌و خدمەتکارو مەنسووبی ئەوو ، حوکوومەتیش بەناو هەبوو . زۆر لە مەئموورانیش خۆیان هاویشتە باوەشی بۆ مەحفووزبوون لە بەڵای ناگەهانی‌و عەزڵ‌بوون ، چونکە ئەیتوانی لای موتەسەڕڕیف یا والی ئەو مەئموورە ویقایە بکاو ، دێهاتی ئەترافی شاریش لە ئیستیلاو زوڵمی هەمەوەندو عەشایر زۆر پەرێشان بوون . جەردەی هەمەوەند ڕێگای هاتوچۆی کاروانی بەستبوو . حوکوومەتیش هیچ نوفووزی نەمابوو . شێخ بەتەبیعەت لەم ئەحواڵەش بێزار بوو ، دەستی‌کرد بە تەعقیبی جەردەو کوشتار لێ‌کردنیان . خدمەتکاری بۆ ئەم ئیشە مەعلووم کرد . لە هەر مەکانێك خەبەری ئەشقیا بووە ، پیاوی شێخ چوونە سەریان لەگەڵیان کەوتنە[3] شەڕکردن . زۆر جار شێخ (بالنفس) بۆ تەعقیبیان چووە .

---

(٢) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «مەدرەسەی» .

(٣) ئەبوو «کەوتوونە» بووایە .

ئەسپو ماینیان لێ ئەکوشتن ، تالانیان لێ ئەسەندنەوە ، هەتا هەمەوەند مەجبوور بوون لە بازیان بەولاوە نەیانئەتوانی بڕۆن[٤] . دێهات چاویان کرایەوە ، ئیتر ئیمدادیش نەبوایە مودافەعەی خۆیان ئەکرد ، خۆیان بە پیاوی شێخ مەحموود حیساب کردبوو .

شوهرەتی بۆ ئەتراف بڵاوبووەوە لە ئێرانەوە ، لە گەرمیانەوە ، ئاغایانو بەگزادان بۆ خاتری ئیرتیباتی لەگەڵ پەیدابکەن بازی چاك ، ماینی جنس ، تانجیو کەویان بەدیاری بۆ ئەنارد . ئەویش بەنەزەر شەخسەوە خەڵاتو نیعمەتی ئەنارد بۆ ئەو ئاغایانەو بەخشش بەوکەسەی دیارییەکەی هێناوە . بە ئینعامو ئیکرام دڵی عالەمی ڕاکێشا . لە هەمووڵاوە دەستە دەسنە بەگزادەو ئاغایانو سەرکردەی عەشایر بۆ زیارەتی ئەهاتن . ئەویش لە خدمەتی کەس قوسووری نەدەکرد . بە پیاوەتی ڕایبوارد ، هەتا حەربی عموومی دەستپێ کرا ، ئەمجا بەناوی غەزاوە سواری کۆ کردەوە ، بۆ موعاوەنەتی عەسکەری تورك چوو بۆ تەرەفی بەسرەو زوبەیر . لەپاش چەند موسادەمەیەك تورکەکان موقابەلەی ئینگلیزیان پێنەکرا ، گەڕانەوە دواوە . شێخیش مەجبووربوو لەگەڵ سوارەی خۆی هاتەوە بۆ سولەیمانی ، دەستیکرد بە تەدارەك بۆ ئیمدادی تورکی کە لە ئێراندا لەگەڵ ڕووس شەڕیان ئەکرد . خۆی گەیاندە جەبهەی حەرب . ڕووسەکان کاغەزیان بۆ نووسیو شیرێکیان خەڵات بۆ ناردو وەعدی زۆر گەورەیان دا کە بۆی بکەن بەشەرتێ ئیشتیراکی شەڕ نەکا .

---

(٤) لەبەرئەوە کە زێوەر لە سولەیمانییەوە قسەئەکا ، ئەبوو بیوتایە : «لە بازیان بەمڵاوە نەیانئەتوانی بێن» .

(دیانةً) شێخ ئیعتیمادی بە وەعدو وەعیدی ڕووسەکان نەکرد ، هەتا نیهایەتی حەربی عوموومی لەگەڵ تورکەکان بوو . کە بەغداو کەرکووك سوقووتی کرد ، دووبارە سولەیمانی کەوتە ئیختیلال و موشەووەشی . تورك نوفووزی نەمابوو . دووبارە حیمایەو ئاگەهداریی مەئموورانی کرد .

کە ئینگلیز هاتنە سولەیمانی ، بەسواری خۆیانا ، ئەو مەئموورانەی مابوونەوە ڕەوانەی مووسڵی کردن کە بیاننێرنەوە تورکیا[٥] . باقیی مەئموور کە کورد بوون لە سولەیمانی‌یا مانەوە . ئینگلیز لەژێر ئیدارەی شێخدا حوکوومەتێکی وەتەنیی دروست‌کرد . تا چەند مانگێك ئینگلیزەکان موعامەلەیان باش بوو ، لە ئاخردا سیاسەتیان گۆڕی . شێخ تەحەمولی دەسیسەو حیلەی ئەوانی نەبوو ، موخالەفەی ئەکردن . نەتیجە بوو بە شەڕ لە بەینی حوکوومەتی وەتەنی و ئینگلیزدا . ئینگلیزەکان غاڵب بوون ، شێخ ئەسیر کرا . تەفسیلات خۆیان بە کتێب نووسیویانە ، (گەنجینە) عەلاقەی بەسەر تەئریخ نووسینەوە نی‌یە ، هەر ئەحواڵی تایبەتیی (مەردان) ئەنووسێ . حەفدە ساڵ شێخ بە کەشاکەشی حەبسی و ئەسیری مایەوە . ئەمما وەقتێ کە لە بەغدا بوو ، هەروەك سولەیمانی ، قۆناغ و دیواخانی مونتەزەمی هەبوو . لە هەموولایەکەوە میوانی بۆ ئەچوو و خەڵقی ڕووی‌ئەکردە دەرگای . ئەویش بە واسیتەی ئەو مەعاشەی کە حوکوومەت بۆی مەعلووم کردبوو و واریداتی ئەملاکی کە لە سولەیمانی‌یەوە بۆ[٦]

---

(٥) ئەم ڕستەیە ئاڵۆزە . بەڵام مەبەست لێی ئەوەیە ئەو مەئموورە تورکانەی مابوونەوە لە سولەیمانی ، شێخ مەحموود بە سوارەی ئینگلیزدا ڕەوانەی مووسڵی کردن ، تا ئینگلیزەکان لەوێوە بی‌یانێرنەوە بۆ تورکیا .

(٦) ئەبوو «بۆی» بووایە .

ئەچوو ، خدمەتی میوانی ئەکردو ، ئەوی بۆ ئیحسان‌و ئینعام ئەچوو بێ‌بەشی نەدەکردو ، ئەوی بۆ وەزیفەو مەئموور یەت دەخالەتی پی‌ئەکرد ، لە وەزارەتەکانا سەعیی بۆ ئەکرد ، ڕجای بۆ ئەنووسین[7] . بۆ بەعزێ (بالذات) خۆی ئەیبرد بۆ دائیرەی حوکوومەت . نوفووزی تەئسیری هەبوو ، ڕجایان قوبوولێ ئەکرد . هەتا مەسئەلەی ئیختیلافی ئینگلیزو عێراق لە زەمانی ڕەشید عالی گەیلانی‌زادە لە بەغدا مایەوە . کە شاری بەغدا کەوتە خەتەرو تەهلوکەوە (مجبورا) بەغدای تەرك کرد ، ڕووی‌کردەوە لیوای سولەیمانی ، چوو لە (داریکەلی) لەسەر موڵکی خۆی دانیشت‌و حوکوومەتیش ڕازی‌بوو بێ‌تەرەفانە هەر لەوێ دانیشێ . حاڵی حازر لە داریکەلی بە زەراعەت ، بە فەلاحەت ، بە خدمەتی ئایندەو ڕەوندە مەشغووڵە . لای کەمی ڕۆژی پەنجاه کەس بەڵکو زیاتر ڕووئەکەنە دیواخانی ، ئەبێ خدمەتیان بکرێت‌و ، زۆر کەسیش بۆ ئینعام‌و ئیحسان ئەچێتە[8] خدمەتی ، ئەوانیش مەحرووم ناکا . لە ساداتاکە مەرد مابێ تەنها ئەوە . وە بۆ ڕجای فەقیران لای مەئمووران قوسوور ناکا . هەرکەس موراجەعەتی پی‌ئەکا هەتا لە ئیقتیدار یا بێ سەعیی بۆ ئەکا . بەخۆشی‌و سەربەستی ڕائەبوێرێ‌و زۆر ڕەفاقەتی عولەماو ئەهلی دینی پی‌خۆشە . زۆر حەز لە لەتیفەو نوکتەبازی ئەکاو تەبیعەتی شیعری‌یەشی هەیە . زۆر شیعری جوان جوانی گوتووەو قەدری شاعیران‌و مونەووەران ئەگرێت . وە[9] لە

---

(٧) ئەبوو «ئەنووسی» بووایە .

(٨) ئەبوو «ئەچنە» بووایە .

(٩) ئەم «وە»یە پێویست نی‌یە مەگەر مەبەستی «وا» بێ .

ئەشعاری ئەو کە دەستمکەوتووە ، ئەم چەند شیعرەم نووسی‌یەوە . ئەمانە بەنەزەر ئەشعاری بە لەتیفەو بە نوکتەی هیچ نی‌یە[10] :

**با زەمزەمە گریانە لەنێو مەجلیسی عیشقا**
**ساقی خەبەری داوە کە یار نایەتە یاری**
**قەت نابیێ ئەو دولبەرە فەریادی منو تۆ**
**سەد بارە کەبابی دڵەکەم بیکەمە دیاری**
**دوو جۆگەیی خوێنینە بەسەر سەفحەیی رووما**
**گوڵێ گوڵ بووە داوێنو کەنارم ، وەرە دیاری**
**ئەو خاڵە زوخاڵێکە لەنێو بۆتەیی دڵما**
**رۆحم ئەکوڵێنێ بەنەفەس کوورەیی ناری**
**ئەی مورغی ستەمدیدە ئەسیری لە قەفەسدا**
**بۆ خۆتو وەتەن بگری کە سەمخوردەیی ماری**
**دەس ناکەوێ تریاکی منو تۆ لە عێراقا**
**با گریە بچین تا بە لیقای حەزرەتی باری**

جەنابی خالق ئەم زاتە بۆ خدمەتی فەقیران بەرقەرارو عومردرێژ بکا .

---

(١٠) ئەبوو «نین» بووایە .

# له هەولێر شێخ موحییدین ،
# له کەرکووك سەیید ئەحمەد

له شاری هەولێر ، له ساداتی بەرزنجی شێخ موحییددین کوڕی شێخ موحەممەدسالّح که له حەیاتایه ، ساحیبی تەکیەو میوان ، ئەویش به ماڵی حەلاڵی ، به ڕەنجی شانو باڵی خۆی ، بۆ خدمەتی میوانو دەروێشان له مەیدانا ڕاوەستاوه . زاتێکه خۆش‌خولّق ، سەخی‌تەبع ، بەئیکرام . بۆ هەرکەس ڕووی تێ‌بکا بۆ هەر کاری بێت ، سەعی‌ئەکا ، تێ‌ئەکۆشێ . هاتوچۆی هیچ مووەززەفێ ناکا . دائیما له ماڵو تەکیەی خۆیا ئامادەی خدمەته ، وه بۆ ڕجای فەقیرانو میسکینان لەلای مووەززەفو مەئموورە گەورەکان به عەریزەو تەحریرات بەیانی ئەکاو ، ئەدیبو کاتبو موحیببی عولەماو شاعیرانه . زۆر کەسی وایه[1] موراعاتی نەقدی‌یەشی ئەکا . تەکیەو دیواخانی شەبو ڕۆژ کراوەتەوه .

* * * * * *

(١) مەبەستی «زۆر کەسی‌وا هەیە»یه .

**سەيید ئەحمەدی خانەقا**

وه له شاری کەرکووکیش سەیید ئەحمەدی کوڕی شێخ حوسەین[2] ، ئەمیش له ساداتی بەرزنجی ، حاجیو غازیو سەخیو ڕووخۆشو لەتیفەگۆ . سفرەی سەخاوەتی بۆ پیرو جوان ، بۆ ئەهلی لادێو شارستان ڕاخستووه . فەخری کوردستانو شێری مەیدانه . زۆر ئەدیبو عاقڵو سیاسیو داناو ئیشزانه . تەعریفی بەم چەند دێڕه تەواو نابێ . دەردی عەجەمەکان (ضرب المثل)یانه «برو ببین» به چاوی خۆت بچۆ ببینه ، ئەوسا مەردیی ئەو مەعلووم ئەبێ . خوا میسلی زۆر بکا .

**جەنابی شێخ موحییددین له هەولێر**
**ئەکا ڕووتو فەقیران پۆشتەو تێر**
**له کەرکووکا جەنابی سەیید ئەحمەد**
**لەبۆ خدمەت موهەییایه وەکوو شێر**

* * * * * *

(٢) مەبەستی سەیید ئەحمەدی خانەقایه .

وەکوو بیستوومە عەبدوڕڕەززاق ناوێك لە کەرکووك مزگەوتێکی
دروستکردووە ، نزیك بیست سی هەزار دیناری لە مزگەوت و ئەوقافیا
سەرف‌کردووە . لازمە ئەم زاتەش داخڵی (گەنجینە) بکرێت . خوا
ئیحسانی قوبووڵ کات .

# حەفسە خان کچی نەقیب شێخ مەعرووف

فیردەوسی لە مەدحی ژنانی زابلوستان وتوویەتی : «زنانشان ز مردان دلاورترند»

لە ساداتی سولەیمانی ، ئەوی خدمەت‌و دیانەتی هەبوو ، نووسراوە . ئەمما لە خانمانیان حەفسە خان کچی نەقیب شێخ مارف لەوانەیە کە ناوی گومنەبێ ، هەتا قیامەت ناوی بمێنێ ، ئەویش بە نووسینی لە تەئریخدا یا لە (گەنجینە)دا ئەبێ . من چونکە شارەزای ئەخلاق‌و دیانەت‌و سەخاوەت‌و ئیحساناتی ئەوم ، ویستم لە (گەنجینە)دا ناوی بنووسم هەتا ئەم خانمە

نەجیبە بەدینە بەمروەتە کە لە هیچ مەردێ کەمتر نی یە ، شوهرەتی بمێنێتەوە ، بە ڕەحمەتو بە دوعای خێر یادبکرێت . دەستی سەخای ئەم خانمە ، تەبعی ڕەشیدی بۆ هەموو کەس بە بێ فەرق کراوەتەوە . لە هەتیوو بێوەژن بەخێوکردن قوسووری نەبوە . هەتا ئیستا چەند تاقم هەتیوی گەورە کردووەو چەند ژنی بێ مێردی لە تەنگانە نەجات داوە . ئێواران فەقیرو هەژارو حافزو کوێر لە بەردەرگانەکەیا کۆئەبنەوە بۆ نانو شۆربا وەرگرتنو ، ئینعامو ئیحسانی بە هەموو شاردا بڵاوبووەتەوە . ئەو واریداتەی کە لە ئەملاك بۆی دێتەوە هەمووی بە ئینعام سەرفی دۆستانو ناسیاوو خدمەتکارو فەقیرانی ئەکاو بۆ خدمەتی مەعاریف چەند جار ژنانی شاری جەمع کردووە ئیعانەی کۆکردووەتەوەو ، بۆ لێقەوماوان هەرکەس پەنای پێ ئەبا دەستیان[1] ئەگرێت . هیچ جەمعییەتێکی ئیعانە لە سولەیمانی یا دانەنیشتووە ئیللا ئیشتیراکی ئەو ئیعانەی کردووە ، بەشی خۆی پارەی داوەو دیواخانەکەشی کە لە ئیدارەی شێخ قادری ئامۆزاو زەوجی مەشرووعیدایە وەك زەمانی نەقیبی مەرحوومی باوکی یە لە ڕەغبەتایە . ئەتوانم بڵێم بەنەزەر زەمانەوە گەلێ شتی زیاترە لەو زەمانە . میوانیش لەو دیواخانە ئەسبابی ئیستیراحەتی تەواوە ، خدمەتی زیادی ئەکرێت . ساڵێ دانیشێ میوان ڕووگرژی لە کەس نابینێ . وە بەقەدەر میوانی خاریج ، هەر لە شاردا دائیما دەستە دەستە ژنان بۆ خدمەتی ئەچن . حەفسەخان لە سەففانە کچی حاتەم سەخی ترە کە باوکی ڕۆژێ پێی ئەڵێت : سەففانە تۆ وا دەستبڵاوو من وا ، هەموو ماڵی دنیا بەشمان ناکا . یا تۆ

---

(١) ئەبوو «دەستی» بووایە .

دەستبگرەوە ، یا من . ئەویش ئەڵێت لە تۆوە فێربووم مەکاریمی ئەخلاق ، ناتوانم خۆم بگرم . ئەمیش بەو هەموو واریداتو مەحەللی سەروەتەوە کە هەیەتیساڵبەساڵ قەرزدار ئەمێنێتەوە . لەگەڵ سەخاوەتی ، دیانەتیشی ئیسباتی کردووە کە لە نەوەی حەزرەتی کاکئەحمەدە ، قەدری عولەماو مەشایخی تەریقەتی زۆر لەلایە . چەند جار بۆ زیارەتی حەزرەتی غەوس چووەتە بەغدا . ئەگەر زیاد لە مەساریفی بەیتییەو دیواخان نەقدی ببوایە تەوافی بەیتوڵڵاو ڕەوزەی موتەهھەرەی ڕەسولوڵڵاشی دەکرد . خوا بۆ خدمەتی فەقیران بەرقەراری کا .

# عەرەب

قەومی بەرزی عەرەب لە هەموو عەسرێکا پیاوی بە مورووەت ، بە ئینساف ، بە سەخاوەت‌و کەرەمی زۆر بووە . تەواریخ لە ئیسم‌و کرداریان پڕە ، ئیحتیاج بە بەیان ناکا . نیهایەت بەشی ئەوانیش لە مەردان ، چەند زاتێ لە گەنجینەدا ئەنووسم .

* * * * * *

(أولاً) لەپێش ئیسلامیەتدا ئەوانەی مەشهوورن : حاتەمی تائی ، هەریم کوڕی سینان ، کەعب کوڕی مامەی ئەیادی[1] . مەشهووریان حاتەم‌و کەعبە کە ناویان بووەتە (ضرب المثل) ، کرداریان لە کتێبی تەئریخدا نووسراوە .

* * * * * *

لەپاش ئیسلامیەت ئەو زاتانەی کە خدمەتیان بە میللەت کردووەو بە سەخاوەت مەشهوورن (أولاً) حەزرەتی عەلی . حەزرەتی حەسەن . عەلی فەرموویەتی : حەیا مەکە لە بەخششی کەم ، مەئیووسی کەمترەو ، هەم

---

(١) کعب بن مامة الایادي : ئەڵێن ئەوەندە دەهەندەو دڵاوا بووە ، لەگەڵ برادەرێکی لە شوێنێکدا ئەبن ، هەردوکیان زۆر تینوویان ئەبێ‌و بە هەردوکیشیان چۆرێ ئاویان لا ئەبێ ، کەعب چۆرە ئاوەکە ئەدا بە برادەرەکەی‌و خۆی لەتینوانا ئەمرێ .

فەرمووبە : کەسێك ئیحتیاجی بیێ لە کاغەزێکا بۆم بنووسیێ موحافەزەی لە سوئال ئەکەم[٢] . ڕۆژیێ عەرەبێك هاتە خدمەتی گوتی : ئەی (امیر المؤمنین) ئیحتیاجی‌یەکم هەیە حەیائەکەم عەرزت‌بکەم . فەرمووی لەسەر ئەرز بینووسە . نووسی من فەقیرم . فەرمووی بە قەنبەری عەبدی دەستیێ جلی منی لەبەربکە . فەقیر وتی منت پۆشتە کرد ، ئەم بەرگە ئەدریێ ؛ منیش بە سەنای جوان تۆ پۆشتە ئەکەم . وتی قەنبەر سەد دیناریشی بدەریێ . قەنبەر وتی ئەگەر ئەم پارەیە بە موسوڵمانانا بلاوبکەیتەوە ئیسلاحی حاڵیان ئەبیێ . فەرمووی قەنبەر بیێدەنگ بە ، من لە (رسول اللّه)م بیستووە شوکری ئەوکەسە بکەن سەناو مەدحتان ئەکا .

* * * * * *

مونکەدیر پیاویێ بوو هاتە خدمەت حەزرەتی عائیشە ، وتی ئەی دایکی موسوڵمانان تووشی فەقیری بووم[٣] . فەرمووی هیچم نی‌یە . ئێستا دە هەزار درهەمم بوایە ئەمدایتیێ[٤] . مونکەدیر ڕۆیە دەرەوە . لەووەقتەدا لەتەرەف خالیدی ئەسیەد دەهەزار درهەمی بۆ هات . دەست‌بەجیێ ناردی بۆ مونکەدیر ، بە هەزار درهەمی جاریەیەکی کڕی ، سیێ کوڕی لەو جاریە بوو موحەممەدو ئەبووبەکرو عومەر ئەولادی مونکەدیر ، لە ئیسلامیەتدا ئەکرەمی عەرەب بوون .

* * * * * *

---

(٢) واتە : لەوەی ئەپارێزم کە ناچاری سواڵکردن بیێ .

(٣) ئەمەش نموونەیەکی تەرجەمەی حەرفی‌یە ، وەرگێڕانی (أصابنی الفقر)ی عەرەبی‌یە ، کە ئەگەر بەشێوەیەکی ڕەوانو ڕەسا بیکەین بە کوردی ئەڵێین : گرفتاری دەستی هەژاری بووم ، یا هەژاری گرفتاری کردووم .

(٤) لە دەسنووسەکەدا «ئەمدایەتیێ» نووسراوە .

ئەکرەمی عەرەب تەلحە کوڕی عوبەیدوڵلاّ خوا لێی ڕازی بێ ، زیاد کوڕی جەریر ئەگێڕێتەوە کە لە مەجلیسێکدا تەلحەم دی دەهەزاری سەرف‌کرد ، کەچی بە دەستی خۆی دەرپێکەی پینە ئەکرد .

* * * * * * *

ئەشعەس کوڕی قەیس ناردیە لای عەدی کوڕی حاتەم مەنجەڵەکانی باوکی لێ خواست ، مەنجەڵیان لازم‌بوو . ئەویش هەموو مەنجەڵەکانی پڕکرد لە زەخیرە بۆی نارد ، وتی ئێمە بە بەتاڵی مەنجەڵ نادەین بە دراوسێ .

* * * * * *

موعاویە لە حەزرەتی حەسەنی پرسی : کەرەم کامەیە ؟ فەرمووی : لەپێش تەڵەب‌و داواکردنا تەبەڕڕوع بکەی‌و ڕەحمت بە سواڵکەر ببێ لەگەڵ بەخشین .

* * * * * *

عەبدوڵلاّ کوڕی ئەبووبەکر لە مەردانی مەشهوورە . ڕۆژێ بە ڕێگایەکدا ئەڕوا ، تینووی ئەبێ . لە ماڵێ داوای ئاوی بۆ ئەکەن . ئافرەتێ ئاوی بۆ دێنێ . لە پەنا دەرگاکە ڕائەوەستێ نایێتە دەرەوە . ئەڵێت ئەمر بکە خدمەتکارێکت بێت بۆ ئاوەکە ، من ژنێکی بێ‌مێردم ، بێوەژنم ، عازەبم . عەبدوڵلاّ ئاوەکەی خواردەوە ئەڵێت دەهەزار درهەمی بدەنێ . ژنەکە ئەڵێت بۆچ گاڵتەم پێ‌ئەکەی ؟ ئەفەرموێ بیست‌هەزاری بدەنێ . وتی خوا عافیەت‌و سیححەتت بداتێ . وتی سی‌هەزار درەمی بۆ بێنن . عەبدوڵلاّ عادەتی وابوو نەفەقەی چل ماڵ دراوسێ لای ڕاست ، چل لای

چەپ ، چل لەپێشەوە ، چل لەپاشەوە[٥] ئەداو هەموو گۆشتی قوربانیی بۆ ئەناردن . لە جەژناندا بەرگی بۆ ئەکردن‌و هەموو جەژنێ سەد عەبدی ئازاد ئەکرد ، خوا لێی ڕازی بێ .

* * * * * *

عەبدوڵلاّ کوڕی جەعفەری[٦] یەکەم پیاوی مەیدانی سەخاوەت بووە . کە موعاویە وەفات‌ئەکا بۆ تەعزیە ئەچێتە لای یەزید . ئەویش لێی‌ئەپرسێ ساڵیانە لەتەرەف باوکمەوە[٧] چەندت بووە ؟ ئەڵێت هەزار هەزار درهەم . یەزید ئەڵێت وا منیش ئەوەندەی کەم لێ زیاد کرد ، چونکە بەپرسەوە هاتووی ، ڕەحمت هەیە . بە یەزیدیان گوت چۆن دروستە لە بەیتولمالّی موسوڵمانان ئەم میقدارە ئەبەخشی بە تەنها پیاوێ ؟ ئەویش گوتی وەڵلاّ بە هەموو ئەهلی مەدینەم داوە . جاسووس شوێنی ئەکەوێ بزانێ ئەو پارەیە چۆن سەرف‌ئەکا . کە ئەگاتە مەدینە دەست‌ئەکا بە خەرج‌و سەرفی بەناو ئەهالیدا . لەپاش مانگێ ئیحتیاجی کەوتە قەرزکردن .

* * * * * *

جارێ لەگەڵ حەسەن‌و حوسەین‌و ئەبوو قوحافە ئەچن بۆ سەفەر ، بارانیان لێ دائەکا ، پەنا ئەبەنە ماڵێکی[٨] عەرەب لە خێڵێکدا . ئەویش

(٥) ئەبوو «لەپاشەوەی» بوایە .

(٦) لە دەسنووسەکەدا وا نووسراوە . وابزانم ڕاستەکەی «جەعفەر» ە .

(٧) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «باوکمە» .

(٨) ئەم وشەیە لە دەسنووسەکەدا بەم‌جۆرە نووسراوە : (مالکی) ، لەگەڵ دانانی نیشانەی (ژێر) لەژێر لامەکەوە . لەوە زیاتر کە مەبەست (ماڵێکی) بێ ، بۆچوونێکی‌ترم نەبوو لە خوێندنەوەیا .

مەرێکیان بۆ سەرئەبرێت . سێ شەو مانەوە هەتا باران خۆشی کردەوە . کە ڕۆیشتن عەبدوڵلا بە عەرەبەکەی گوت ئەگەر هاتیە مەدینە ئەحواڵی ئێمە بپرسە . لەپاش چەند ساڵێك عەرەبەکە ئیحتیاجی پەیدائەکا ، ژنەکەی وتی بۆچ ناچیە مەدینە بۆلای میوانەکانمان ؟ وتی ناوەکانیانم لەبیرچووەتەوە . گوتی بڵێ (ابن الطیار) . کابرا چووە مەدینە تووشی حەزرەتی حەسەن بوو . ئەمری کرد سەد وشتری بە شوانو فەحلەکانیانەوە بدەنێ . لەپاش ئەوە چووە خدمەت حەزرەتی حوسەین ، وتی کاکت لە وشتر دەوڵەمەندی کردووین . فەرمووی هەزار سەر مەڕی بدەنێ . لەپاشا چووە لای عەبدوڵلا ، وتی لە مەڕو وشتر دەوڵەمەند بووم . ئەمری کرد سەدهەزار درهەمی بدەنێ . چووە لای ئەبووقوحافە ، وتی من وشترو مەڕو پارەم نی یە ، وشترەکانت بێنە باریانکەم لە خورما . ئیتر دەوڵەتو خۆشی لە عەرەب (٩) جوێنەبوەوە هەتا وەفاتی کرد . (لە «المستطرف»ەوە) (١٠) .

* * * * * *

بۆنموونەو تەبەڕڕوك لە پیاوانی ئیسلامی عەرەب ئەم چەند زاتەم نووسی ، وە ئیللا بە سەد جەڵد کتێب ناوی مەردانی عەرەب تەواونابێو مەناقیبیان خۆیان بەتەفسیل نووسیویانە .

---

(٩) واتە : لە کابرای عەرەب .

(١٠) لە دەسنووسەکەدا بێ ئەلف‌لامی تەعریف بوو .

پیرەمێرد چاپخانەی ڕۆژنامەکەی ئەخاتەگەڕ

# پیرەمێرد

ڕەفیقی سەفەرو حەزەرم ، دۆستی داناو موعتەبەرم ، پیرەمێردە ، کە ناوی حاجی تۆفیق بەگە ، ئەم پیرە لە سولەیمانی تەحسیلی ئیبتیدائیی تەواو کردووە ، لە ئەستانبوولیش حوقووق . جەنابی حەق بەهرەیێکیوای لە عیلمو مەعریفەتدا داوەتیٚ ئەتوانم بڵێم لە سولەیمانیدا هاوتای نی یە . لەپاش تەحسیلی ئیبتیدائی مەهارەتو ئیقتیدارێکی تەبیعیی لە کیتابەتی تورکیو فارسیو عەرەبیدا بوو ، بەوواسیتەوە حوکوومەت موحتاج بوو بە کەسێکیوا لە وەزیفەدا ئیستیخدامی بکا . بە باشکاتبی مەحکەمە تەعیینکرا . موددەتیٚ لەسەر ئەو وەزیفەیە بوو . نەقیب شێخ موستەفا ئیحتیاج بوو بە کاتبی خوسووسی بۆ لای خۆی ، دڵخۆشیی دایەوە ، بردیە لای خۆی کە عەینی مەعاشی حوکوومەتی بداتیٚو مەسرەفی جلو بەرگو خواردنیماڵو مناڵیشی عەلاوە بێتو خۆیشی دائیما لە سەفەرو حەزەردا لە خدمەتی خۆیدا بێت ، هەموو تەدارەکاتیو ئەسپی سواریو مەیتەر بۆ ئەسپی ببێت . بەم شەرائیتە چووە خدمەتی شێخ موستەفا ، تەرکی خدمەتی حوکوومەتی کرد کە حوڕڕیەتو سەربەستیی لەوێدا زیاتر بوو ، ئەویش تەحریراتی بۆ ویلایەت یا ئەستەنبووڵ یا موتەسەڕڕیفیەت ببوایە ئەینووسیو ئیشو کارێکی نەقیب لە دائیرەیێکدا بوایە ئەچوو تەعقیبی

ئەکرد . باقیی بە ڕاوو شکار لەخدمەت نەقیبدا ڕای ئەبوارد ، تا لەخدمەتیا چوو بۆ ئەستەنبوولّو لە ئەستەنبوولّەوە ئیشتیراکی سەفەری حیجازیشی کرد ، نائیلی تەوافی بەیتوڵلاّ بوو . کە نەقیب لە مەککەی موکەڕڕەمە وەفاتی کرد لەخدمەت شێخ سەعیددا دێتەوە ئەستەنبوولّ ، لەوێدا مایەوە ، نەهاتەوە سولەیمانی . بە واسیتەی ئیستیعدادی تەبیعی لەسەر وەزیفە موعەتتەل نەبوو ، کرا بە مودیری ناحیە ، بە قائیمەقام ، هەتا موتەسەڕڕیفی تەرفیعی کرد . لە ئیعلانی مەشرووتیەتی عوسمانی[1] لەگەلّ کوردەکانی ئەستەنبوولّ جەمعی یەتیان دروستکرد بۆ خدمەتی کوردو نەشری غەزەتەو مەجەللەیان دەستپیّ کرد ، ئەمجا کەوتە خدمەتکردن بۆ میللەتو وەتەن بە هەموو ڕەنگیّ ، لە خدمەت دوانەکەوت .

لەپاش چەند سالّو کەشاکەشی حوڕڕیەتپەروەرانە هاتەوە سولەیمانی . لە سولەیمانی یش لەخدمەت زیادیکرد ، غەزەتەی (ژیان)و (ژین)ی بیستوپێنج سالّ بە فیکری بیکری ، بەقەڵەمی ئاگرینی بلاّوئەکردەوە . ئەدەبیاتی کوردی ژیاندەوە . بە چەند سەترێکی غەزەتەکەی پەندی پێشنیانی هێنایەوە بەرچاو کە ئەو پەندی پێشینانەی دیوانێکی مەنزوومەی خۆیەتی .

هەر بە خدمەتکردن ، نووسین ڕازی نەبوو ، کەسیّ ئیشێکی ببوایە یا موحتاج ، خۆی (بالذات) شوێن ئیشەکەی ئەکەوت هەتا بۆی ڕێك ئەخستو دەفعی ئیحتیاجی موراجیعینیشی لەلا وەکو فەرز وابوو . خوا تەبیعەتێکی وای داوەتیّ پارەو مالّی دنیا لەنەزەریا بیّ قەدرو قیمەتە .

---

(١) ئەبوو «عوسمانیدا» بوایە

ئەو مەعاشەی کە بووی لەگەڵ مەنافیعیٚ کە لە غەزەتە پەیدای ئەکرد ، بەشی مەساریفی ئەو نەبوو کە موجەڕڕەدو تەنهاش بوو .

جەژنی نەورۆزی لە سولەیمانیدا زیندووکردەوە . هەموو ساڵیٚ ئەووەڵی بەهار نزیك سەد بار داری ئەکڕی لەلای گردی سەیواندا ئەیکردەوە بە ئاگرو بۆ زائیرین خێوەتو ڕەشماڵ لەو دەشتەدا هەڵئەدرا ، عوموومی مەئموورینو تەلەبەو توججارو ئەشرافی دەعوەت ئەکرد بۆ زیافەتی جەژنی نەورۆز ، مەسرەفێکی زیاد لە چێشتو گۆشتو حەلەویاتو قاوەو چایی ئەکرا بۆ ئەم هەموو خەڵقەو ژنانیش بەجویٚ خێوەتو ڕەشماڵیان بۆ ڕێکخرابوو ئەهاتنە ئەم سەیرانە . خۆلاسە ئەوی ئەو ئەیکردو ئەو شادیو سوروورە کە دڵی ژنو پیاوی خۆش ئەبوو[٢] ، هیچ مەلیکیٚ لە جەژنی نەورۆزدا نەیکردووە .

لە خوسووسی دیانەتەوەش هەتا لە دەستی بیٚ ، بیٚقوسوورە . ئەکسەری ساڵ مەولوودێکی پێغەمبەر لە مزگەوتەکەی هەمزەئاغا کە ئەو مزگەوتەش باپیری ئەو بینای ناوە ، ئەخوێنیٚ . حافز قورئانو مەلایانو تەلەبەی عولووم دەعوەت ئەکا بۆ ئەو مەولوودەو تەعامێکی زۆریان بۆ ئەکا . لە هەموو حەفلەیەك کە لە سولەیمانیدا بۆ ئیعانەی مەعاریف بێت یا فەقیران یا سائیرە ، حازرە وەك دەعوەتکراوەکان بەقەدەر خۆی ئیعانە ئەدات وە زیاد لەوان بۆ تەرغیب خوتبەش ئەخوێنیٚ .

ئەو جەژنی نەورۆزەی کە لە سولەیمانیدا زیندووی کردەوە تەئسیری کردە ڕۆحی هەموو تەلەبەی مەداریس . لە هەولێر ، لە کەرکووك ، لە کۆیە ، لە سەلاحیە ، لە خانەقین ، حەتتا لە شاری بەغدا ، ئەم جەژنە بە

---

(٢) ئەبوو «پیٚ خۆش ئەبوو» بووایە .

زەمزەمەو خۆشی‌یەوە ئیجرا کرابوو . تەبیعەتی مەوزوونی ئاساری لە غەزەتەکانیا دەرئەکەوێ . ئەدیب ، شاعیر ، دانا ، نیکتەگۆیە . ئەمما قەڵەمی لە نەسرا بێ‌میسلە ، کەس نایگاتێ . خوا ئەم پیرەمێردەمان بۆ ئەم نەوعە خدمەتانە لێ نەستێنێ .

خاتیمەی مەردان ، لەسەر ئەم فازیلە با تەواو بێت‌و چاولێ‌کەریان زۆر .

. . . لەووەقتەدا کە چاکتر بوو ولاخ سواریێ بوو[1] . لە تەقەی سمی سواریێ کە هات لە دەنگی تەپڵی فەتح خۆشتر بوو ، حەقیقەت حەزرەتی خدری من بوو . لە خدمەتکارانی شێخ جوانمەردیێ بوو تەکلیفی سواریی کردم . بەمەمنوونی قوبووڵم کرد ، هەتا گەیاندمیە چاخانەی (بناویلە) . پێشمکەوت . کە چوومە ئەویێ سەیید کەریم ئەمریکرد چایان بۆ هێنام . پارچەییێ نانیشم دەستکەوت . ئەوەندە هێزم پەیا کرد بتوانم بەپیادەگی بچمە (نۆدیێ) . گەیشتمە نۆدیێ . بە خواردنێکی کەم شێوم کردو نووستم . کەس خەیاڵی دیلیی شێخی نەدەکرد ، وەئیللا لەو نەوعە جێگایانەش نانمان دەست نەدەکەوت . نازانم بێغەم نووستم یا کوفت بووم . بە گەرمای هەتاو خەبەرم بووەوە . ئیتر ڕۆژوو نەما . ئان بە ئان حاڵێ دەگۆڕا . چووینە (چنگنیان) . بەساردی قوبووڵێ کراین . سەیید کەریم لە حاڵیان حاڵی بوو .

**پیاو کە دووچاری ڕۆژی نەگبەت بوو**
**دۆستی جانییشی لێ دەبێتە عەدوو**

---

(١) لەبەر دابڕانی ئەم ڕستەیە لە پێشەوەی ، بەهۆی فەوتانی لاپەڕەی یەکەمو دووهەمی دەسنووسەکەوە ، بەتەواوی لە واتای ڕستەکە دڵنیا نیمو لەوانەیە ئیشارەتی سەر تیپەکانیشم بێهەڵە دانەنابێ . هەروا ، تاڕادەیەك ، لە دێڕی پاشەوەشدا .

ئەمری‌کرد ئولاغیان هێنا ، بارگیرێکیشی دا بە من . سواربووین بۆ مەرکەزی ئیجتماع (کانی شیلان) . کانی‌شیلان میقداری دوو سەعات زیاتر لە دێی چنگنیانەوە دوورە ، جێگەیێکە بەسەفا ، کوێستان ، ئاودار ، هەوادار . بۆ موددەعی ڕێگایێ نی‌یە بچێتە سەر ئەو جێگایە یەك ڕێگا نەبێ ، ئەویش بە پێنج شەش تفەنگچی‌یەك موحافەزە ئەکرێ . حەتتا تەییارەش لەبەر دارستانی لەو شاخەدا کەشفی بۆ ناکرێ . حاسڵی ، دوو شەو لەوێ ماینەوە . پەراگەندە کۆبوونەوە . ماڵێکی شێخ کە بەجێ‌مابوو بە هەزار مەرارەت گەیشتنە ئێمەو لە شێخ هیچ خەبەرێکمان دەست‌نەکەوت . هەردەمە نەوعە درۆیێك ڕەونەقی مەجلیس‌و قووەتی دڵ بوو .( . . . . )[۲] برای شێخ بە میقدارێ سوارەوە لە شاربازێڕا قووەی مەعنەوی‌یەی بەعزێکمانی زیاد کردبوو . ( . . . . )[۳] . بەیانی بارکرا . چووینە (هەوڵوو) ، ئاوایی تیا نەبوو ، یەك پیاو نەبێ بەدیار تووتنەوە دانیشتبوو . ئێمەش بە هەمووومان کە مەوجوود گەیشتبوە سەدوپەنجا کەسێ ، یەك قۆریە ، دوو پیاڵە ، یەك دوو پارچە مسمان هەبوو . هیچ‌وا هەبوو هەتا نۆبەی چای بەیانیی بهاتایەسەر ، وەقتی چای عەسری دەهات . ئەمما لە جیهەتی خواردنەوە کەس موعەتتەل نەدەبوو . ماڵی شێخ دووسەد سەر مەڕو بزن‌و کارو بەرخیان دەرکردبوو ، هەر ڕۆژی دوو سێ سەر حەیوانمان سەرئەبڕی .

---

(۲) زێوەر خۆی ، چەند نوختەیەکی لەم شوێنەدا داناوە .

(۳) لێرەدا کەسێك بە قەڵەمی قۆپی پتر لە دێڕێکی لە دەسنووسەکە کوژاندووەتەوە . هەرچیم‌کرد هیچم بۆ لێ هەڵنەکرێنرا .

**شێخ قادری حەفید**

دانیشتبووین فکری ئەحواڵمان ئەکرد. ئەحمەدبەگ وتی: ئێمە غافڵین، شێخ یا کوژراوە یا گیراوە، وەئیللا مومکین نی یە خەبەرێکی ئەم ماڵو منالانەی نەزانێ. ئەم قسانەی کە دەڵێن ڕۆیوە بۆ ناو عەرەب یا عوسمانی یا فلان یا فلان، ئەسڵو ئەساسی نی یە. شێخ ئەوەندە بێ ویجدانە لەم عالەمە نەپرسێتەوە؟! من دەچمەوە دەوری سولەیمانی. لەووەقتەدا کاغەزی شێخ قادرو شەککەری دیاری بۆ یەکێکمان گەیشت. لە کاغەزا دەعوەتی ئەحمەدبەگی کردبوو بۆ لای خۆی. هەر لەوێوە سوار بوو. ئیتر بەکمان نەدیەوە[٤].

(٤) لە دەسنووسەکەدا «نەدیوە» نووسراوە.

شەومان بەسەربرد . بۆ قاوەڵتی چووینە (دۆڵێپەموو) . مەردانە ، دۆستانە ، خزمانە ، خزمەتیان کردین . هەدەفمان (سەرکان) بوو ، لەوێ بین هەتا خەبەری شێخ بزانین . گەیشتینە سەرکان . شێخ عەبدول مودیری (پێنجوێن) بوو ، لە ماڵ نەبوو . خەبەرمان بۆ نارد . مەگەر ڕیعایەتی مەئمووریەتی دەکرد ، نەهاتەوە . شەو ساعەت سێ بەپەنهانی هاتە ناومان . ڕەسمی (خوش آمد)ی [٥] بەجێهێنا ، خدمەتی باشی کردین . ئەمما لە دڵا دەترسا . فەرقمان پێ کرد . قەراردرا بچینە (باشماخ) کە دێی نەقیبە ، داخڵی ئێرانە . تەعەڕڕوز بۆ ئەوێ ناکرێ . چای بەیانی خورایەوە . سوار بووین . لە هەموو نوقتەیەك پیاو بۆ خەبەری شێخ ڕەوانە ئەکەین ، جواب هیچ نەبوو . منیش ئەسپێکم بوو لە دەشتا من سواری دەبووم ، لە شاخا ئەو سواری شانم دەبوو ، چونکە لە هەوراز نەدەڕۆی . ڕەشمەکەی بە دەستو شان ڕامدەکێشا ، عەرەقی شینو مۆرم ئەکرد هەتا لە شاخێ سەرم ئەخست . بە هەر نەوعێ بوو گەیشتینە ڕاست پێنجوێن . لەوێدا بەجارێ پەکی کەوت . ناچار ، پیاوێ جووتی ئەکرد . بانگم کرد : ئەم بارگیرە نارِوا ، ئەوا بۆ تۆم بەجێهێشت . وردە وردە خۆم گەیاندە باشماخ .

## مەریوان

باشماخ لە حودوودی مەریوانە ، وە سەعاتێ لە پێنجوێن دوورە . دێیەکی خۆش ، ئابو ئەرازی مەعاف ، ئەهالی فەقیر ، کاسب ، موسوڵمان ، وامانزانی کە لەو دێیەدا ئیستیراحەت ئەبێ . نەمدەزانی

---

(٥) بە فارسی واتە : بەخێرهاتن .

هێشتا ئەووەڵی[٦] سەفەرە . بە فکری هەموولا بە چاکمان زانی خەبەری دەربەدەریی خۆمانو مەوجوودمان بۆ مەحموودخان بنووسین . نووسیمان . لە جوابیا بە چەند سوارێکی خوسووسی کاغەزێکیوای نووسیبوو : باشماخ حودوودە . جێگای ئێوە نییە . بێن بۆ (کانی سانان) .

(مەریوان) بلووکێکە لە ١٦ بلووکاتی کوردستان . موراجەعەتی بە شار (سنە)یە[٧] . لەپێشا حوکوومەت لە قەڵای مەریواندا بووە . لە بێئیدارەیی حوکوومەتی ئێران تێکچووبوو . بەڵێ ئێران حوکوومەتێکە لە کورەی ئەرزا لاموایە حوکوومەتی ئەوەندە بێئیدارە نییە ناتوانم تەشبیهی بە پاشا پاشانەی منالأنیش[٨] بکەم چونکە مندالأن لە وەقتی ئەو یارییەدا زەبتو رەبتو ئینتیزامێکیان هەیە . ئەم قەومی کوردە لە هەر جێگایێ کە هەن لێم مەعلووم بووە[٩] بە واسیتەی بێحوکوومەتیو جەهالەتەوە دوچاری شەقاوەتو سەفالەت بوون . بەڵێ حوکوومەت موعەللیمی ئەخلاقە ، دەتوانێ تەربییەی میللەتی بگەیەنێتە لای ژووررووی سەعادەت . قەباحەتی مەریوانی ناگرم کە هەرچی دێهاتی ئەشرافی سنە یا (خاصە) بوو یەعنی ماڵی میری کە زەبتیان کردبوو ، واریداتی سەرفی قۆناغو دیواخانی خۆیانیان دەکرد .

مەریوان نزدیکی دووسەد دێی خۆش خۆشی ئاوداری ئاوەدان دەبێ .

---

(٦) لە دەسنووسەکەدا «ئەووەڵ» نووسراوە .

(٧) لە هەموو کوردستانی سەر بە (سنە) کە وترا (شار) مەبەست (سنە)یە .

(٨) لە دەسنووسەکەی زێوەر خۆیدا نووسراوە : «منالأنیشی» . دیارە ئەوە هەڵەیە .

(٩) لە دەسنووسەکەی زێوەر خۆیدا نووسراوە : «بو» . من خۆم وا ڕاستمکردەوە .

(گۆلی مەریوان)[10] واقیع بووە لەبەینی دوو شاخ[11] . بناری شاخەکان ئەمبەرو ئەوبەر دێهاتی مەعموورە . پانایی ١٠٠٠ ، درێژیی ئەو گۆلە ٥٠٠٠ گەز دەبێ . ئیستیفادەی تەواوی لێ ناکرێ غەیری ڕاوی تەیرو تویوورو هێلکەی قازو مراوی نەبێ . لامڕوایە بەو واسیتەوە ئەو دێهاتانە ناونراوە (مەریوان) ، هەموو گۆلەکە وەك حەوزی حەوشەیەك وایە پڕ لە مراوی . ئەوانیش مراوی وانن . (مەریوان) تەخفیفی (مراویوان)[12] ە . لە تەرەفی شەرقی گۆل بەقەدەر سێ ئاشگێڕ ئاو جاری ئەبێ . لە ئیستیقامەتی شەرقی جونووبیدا دەڕژێتە (دیالە)وە – (سیروان) . ئەمما لە گەلێ جێگا لەو ئاوە زەراعەتو فەلاحەتی پێ دەکرێ[13] . چوار تەرەفی گۆل (بەتاتلق)[14] زەلکاوە ، دێوی تێبکەوێ نوقم ئەبێ ، قووتیئەدا .ئەو گۆلە ئەگەر وشك بکرێ نەفعو قازانجی بێحیساب ئەبێ . وشككردنیشی ئاسانە . حاسڵی : مەریوان گەرمیانە ، کوێستانە ، دارستانە ، دەشتە ، شاخە ، باخە ، قابیلی هەموو تەرەقیاتێکە .

---

(١٠) بە (گۆلی زرێبار) بەناووبانگە .

(١١) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «شاخە» . ئەگەر لەڕاستیشدا وابێ . ئەبێ لەپێش «گۆلی مەریوان»ەکەوە چەند وشەیەك پەڕیبێ .

(١٢) مادەم زێوەر دروستبوونی وشەی (مەریوان)ی بەمجۆرە لێکدایەوە . پێموایە پێویست بەو دوور ڕۆیشتنە نەبرو . هەر بیوتایە لە (مری‌ئاوان)ەوە هاتوە . باشتر بوو .

(١٣) یا ئەبوو بینووسیایە «ئەو ئاوە . .» یا «زەراعەتو فەلاحەت دەکرێ» .

(١٤) وشەیەکی تورکییە واتە زۆنگو زەلکاو . بە فارسی ئەڵێن «باتلاق» .

# ئەحواڵی پۆلیتیکی[١٥] مەریوان

ئەو دووسەد دێیەی کە وتمان ، هەموو لەژێر ئیدارەی بەگزادەی ئەوێیە . بەشیان کردووە . هەر چەند دێیەك ڕاجیع بە بەگزادەیێکە . ڕەئیسی ئەم بەگزادانە مەحموودخانو کەیخوسرەوخانە . ئەم دوو ڕەئیسەش دائیما بەینیان ناخۆشە . ئەمما غاڵبی‌یەت ئەغلەب بەدەست مەحموودخانەوەیە . ئەهالیو ڕەعیەت ئەوەندە موتیعن لەگەڵ ڕەئیس ئەمری‌کرد بۆ شەڕ ، بۆ شایی ، بۆ هەرچی مەتڵەبێ بێ ، ئامادەن . لە وەقتی موحارەبەی ڕووسو عوسمانیدا خزمەتی مەریوانی بینراوە . مەرکەزی حوکوومەتی ئەوان کانی‌سانانو (ولەژێر)ە . حوکوومەتی سنە ناتوانێ قرانێکیان لێ بستێنێ . مەربووتی‌یەتیان هەر ئەوەندەیە ئەگەر والیی کوردستان لەشکری بۆ تالانو تەنبیهی عەشیرەتێکی‌کەی لازم بوو ، لە مەحموودخانو کەیخوسرەوخان دەنووسێ ، میقدارێ سوارەو تفەنگچی لەژێر ئەمری یەك بەگزادەدا بۆی[١٦] دەنێرن . وەقتی شەڕ ئیتتیفاقی هەردوو ڕەئیس بێ دەتوانن ١٥٠٠ سوارەو تفەنگچی کۆبکەنەوە . لە پێشا عەشیرەتی جاف کە دەچوو بۆ کوێستان زۆری غەدر لە مەریوانی ئەکرد . ئێستا ناتوانێ نزیکیان بکەوێ . هەموویان کوردن ، سوننین . زۆر عەقیدەیان بە مەشایخو عولەما هەیە . مەعاریفیان نی‌یە .

---

(١٥) پۆلیتیکی : سیاسی . پۆلیتیکا : سیاسەت .

(١٦) ئەبوو ئەم «ی»ی «بۆی»ە بخرایەتە پاش «تفەنگچی» یەکەی پێشەوەی .

# حەرەکەت

لە باشماخ هەستاین . سوارەی مەحموودخان پێشمان کەوت . لە ڕێگای شاخەوە کە بۆ ئێمە مەحفووزتر بوو ، کەوتینەڕێ . بە بەر هەر دێیەکدا کە دەڕۆیشتین ئیستیقبال ، حورمەت ، مەمنوونی ، مەحەببەتیان دەنواند تا گەیشتینە کانیساانان . ئەو دێیەش نازیر[17] بەسەر گۆلی مەریوانە . لە بناری شاخایە . باغو ئاوو زەویی لە ئیدارەی ئاوەدانی زیاترە . قەریبی هەفتا خانەوار[18] دەبێ . قۆناغی مەحموودخان زۆر مونتەزەمو بە فەننی میعماری کراوە . دوو قاتە . شانشینەکەی جێگای پەنجا کەس دەبێ . خۆی مەحموودخان پیاوێکی (معتدل القامة) ، ئەسمەر ، مووڕەش ، وەك عادەتی مەریوان پەرچەمو خولامانەدار ، لە مەجلیسا زۆر بەویقار ، زۆرزان ، عاقڵ ، لە ئەحواڵی دنیا خەبەردار . لە تەرتیباتی دیواخانی دەرئەکەوت ساحێب نانو خوانو میرزایە ، ئەمما موکەممەل ڕۆژنامەی تارانو سائیرەی[19] بۆ دەهات . فەرەج بەگی برای بە ئستیقبال نارد ، موهاجیراتو موهاجیرین لە دێی (نێ) لەتەرەف (عیماد)و[20] بەگزادەکانی ئەوێ بەمیوانی ڕاگیریان کردن . من بەند

---

(١٧) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە «ناظرە» . ئەگەر وابێ ، ئەبوو پاشان بنووسرایە «بەسەر گۆلی مەریواندا» ، واتە : بەسەریا ئەڕوانێ .

(١٨) خانەوار : ماڵو خێزان .

(١٩) سائیرە : شوێنیتر .

(٢٠) نەمزانی ئاخۆ مەبەست لەم «عیماد»ە کەسێکی تایبەتییە یا ناوی وەزیفەیەکە .

نەبووم ، لەگەڵ ڕەئووفو بابەعەلی کوڕانی شێخ لەپێشەوە ڕوومانکردە کانی سانان . مەحموودخان کوڕانی شێخی لەباوەش کرد ، ماچی کردن . دەستیکرد بە گریان ، بەقەدەر چارەکێ گریا بەسەر کوڕەکانا ، منیش خەیاڵمکرد کە خان پیاوێکی گەورەیە ، ئەڵبەت خەبەری نەمانی شێخی بۆ هاتووە ، بۆیە[٢١] وا موتەئەسسیرە ، مەگەر ئیزهاری ئیخلاسی شێخو پەرێشانیی مندالآنی کە وای چاوپێ کەوت[٢٢] ، تەئسیری تێ کردبوو . لەپاشا ڕەسمی (خوش آمد)ی بەجێهێنا . قەیسیو سێو میوەی ئەووەختەیان بوو ، هێنایان . سەماوەر هاتە پێشەوە . لەگەڵ مندا گفتوگۆی نەدەکرد ، یا هەر (طبیعةً) بێدەنگ بوو . ئەمما لاموابوو لە موقتەزای تەبعی ئاغاو گەورەی ئێرانییانە کە ئەبێ عەزەمەتفرۆشی بکەن . چامان خواردەوە . نیوسەعاتی مابوو بۆ غورووب هەموو ڕەفیقانم گەیشتنەجێ . مەجمووعی ژنو مناڵو پیاو سەدوپەنجا کەس دەبوو . هەشتا ئولاغ : ئێسترو ئەسپو ماینیشمان دەبوو . ئەم هەموو خەڵقە مونتەزەم چا درا . نانێکی جوان دروست کرابوو . شەو بۆ موزاکەرەی جێگاو ڕێگای ئەم هەموو خەڵقە مەجلیس گیرا . حسەین نازم ، سەیید عەبدوڵلا ، کاکەحەمە ، چەند کەسێکیکە ، لە خدمەتی خاندا گفتوگۆیان کرد . نەتیجە وەها مەسڵەحەت بینرا کە بە کەیخوسرەوخانیش مەعلوومات بنووسن ، بەڵکو ئەویش موعاوەنەتی ئەم موهاجیرانە بکاو لە ڕەقابەتی مەحموودخان عەداوەت نەنوێنێ ، چونکە وەقتەکەی بۆ ئێمە وابوو جووجەڵەیەك عەداوەتی بکردایە زۆر بوو . موختەسەر کاغەزێکیان

(٢١) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە «بۆیا» .

(٢٢) ئەبوو «چاو پێ کەوتن» بووایە .

حسين نازم

نووسی : جەنابی کەیخوسرەوخان ! عائیلەی شێخ مەحموود کە هاتووەتە مەریوان موتەوەججیهی تەرەفی هەورامانو دێهاتی حودوودە ، لازم بوو عەرز بکرێ . جواب : لەبەینی عەشیرەتا بروودەتو عاجزی هەیە . تفەنگچیی ئێمە کە لە سەنگەردان ، نەوەکو لە رووی جەهلەوە تفەنگتان پێوە بنێن . حەزناکەم لەم ڕێگایەوە بێن . والسلام .

ئەم جوابە وەك هەورە تریشقە تەخریباتی لە زیهنی هەمووماندا پەیداکرد . بەتەمای ئیمدادی ئەو بووین . ئەویش ئەوە بوو . حسەین نازم وای زانی کە وەکوو پێشوو کە مودیری پێنجوێن بوو ئەو بەگزادانە ئاشنایی و دۆستی‌یان ئەکرد ، ئیستاش وایە . وتی ، ڕاوەستن ، بچم چیی پێ بکەم . ئەو هەستا ڕۆی . ئێمەش دەستمان‌کرد بە بارکردن . ئینتیزاری جوابمان ئەکرد . مەقسەدیش هەر ئەوە بوو ڕێگای (ولەژێر) بۆ (دەرزیان) نەزدیکتر بوو لە ڕێگای (قەڵا) ، وەئیللا بە ئومێدی هیچی کەیخوسرەوخان نەمابووین . هەر ئەوەندە مەتڵەب بوو ڕێگای ڕۆینمان بدا . عەجایب ئەوەیە لە مەریوانا مەشهوورە کەیخوسرەوخان نوێژ ئەکا . زۆر موسوڵمانەو ، مەحموودخان بە بێ‌دین دانراوە . منیش وتم :

گر مسلمانی همین‌است که (حافظ) دارد
آه اگر از پی امروز بود فردایی[۲۳]

هەموو چاومان لە ڕێگە بڕیبوو حسەین نازم چێ‌دەکا . لەپڕ سوارێ بە غار هات . هەر لەدوورەوە[۲٤] ئیشارەی کرد کە بڕۆن بۆسەر ڕێی قەلاّ . بە دڵی شکستە لە شیددەتی گەرمادا کەوتینەڕێ . بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە (بالك) . (زەهیر) ناوی کەیخوسرەوبەگە لەگەڵ ئەحمەدبەگی برای ڕەسمی میوانداری‌یان بەجوانی بەجێ‌هێنا . چای ئێوارێ خورایەوە . بۆ (نژمار) کە دێی مەحموودخانی هەورامی[۲٥] بوو ، حەرەکەتمان کرد . سەعاتێ لە بالکەوە دوورە . زوو گەیشتینە ئەوێ . مەحموودخان خەبەری زانیبوو ، لە (دزڵی)یەوە بەئیستیقبال حەرەکەتی کردبوو . نژمار لەسەر مەریوانە ، ئەمما دێی مەحموودخانە . ئێمە مواسەلەتمان کردە نژمار[۲٦] . جەنابی خانیش لەگەڵ کوڕیو برایو چەند سوارێك ڕاسیمەی ئیستیقبال (خوش آمد)ی بەجێ‌هێنا ، بوو بە میوانی ئێمە .

---

(۲۳) واتە : ئەگەر موسوڵمانەتی ئەمەبێ کە (حافز) هەیەتی ، ئای ئەگەر لەپاش ئەمرۆ سبەینێ‌یەك بێ . مەبەستی لەوەیە موسوڵمانی وەك ئەو لە ڕۆژی قیامەتدا سزایەکی خەستو خۆڵ ئەچێژێ ، چونکە لە کردەوەی دنیایدا فڕی بەسەر موسوڵمانەتی‌یەوە نەبوە .

(۲٤) لە دەسنووسەکەدا «هەر لەدوورە» نووسرابوو .

(۲٥) بە (مەحموودخانی دزڵی) بەناووبانگە .

(۲٦) واتە : گەیشتینە نژمار .

مەحموود خانی دزلی
(لەگەلّ سیّ کەس لە دەستەو دائیرەیا)

# موزاکەرەی مەریوانیو هەورامی

لە دێی باڵك بۆ خوسووسی تەئمینی جێگاو ڕێگای ئەم موهاجیرانە ، مەجلیسێکی عالیی (فوق العادة) گیرا . (ظاهراً) قیسمێ لە مەریوانی لە دڵا مەیلیان بە قوبووڵنەکردن بوو . قیسمێکی لەگەڵ هەورامی تەرەفداری حیمایە بوون . (خواه ناخواه) قەراردرا نیسفێکی بچێ بۆ دزڵی . ماباقی لە دەرزیان کە دێی زەهیرو مەحموودخان بوو ئیسکان بکرێن . حەرەمی شێخ عائیشەخانو ئامۆزای شێخ عەبدوڵڵاو برای شێخ ئیبراهیمو کوڕی بچووکی شێخ لەتیفو حسەین نازمو جەمیعی قەتارچیو[27] خزمەتکار سوار بوون بۆ دزڵی ، لەگەڵ مەحموودخان کەوتنەڕێ . حەرەمێکی کەی شێخ لەگەڵ شێخ ڕەئووفو باباعەلیی کوڕیو خاڵی ئەو کوڕانە (کاکەحەمە)و منو یەك دوو خدمەتکارو خوشکێکی بێچاوی شێخ بەجێمایـن . هەموومان لوختو موفلیس ، بێتاقمو تەدارەك ، لە نژمارا وەك مار گنگڵەمان دابوو . (واقعاً) مەحموودخانی دزڵی لەگەڵ ئەوانەی بردیە[28] لای خۆی زۆر نەوازشو ئینسانیەتی نواند ، ئەمما بە موقابیلی ئەوە لەگەڵ ئێمە( . . . . . . )[29] . مومکینە لە تەرەف موهاجیرەکانەوە تەحریك کرابوو کە لەگەڵ ئێمە وابێ . وەئیللا خۆ ئەیتوانی بەزوبان بیوتایە عاجز مەبن . بۆ من فەرقی نی‌یە هەمووتان میوانی منن . هەموو دەفعەیێ[30]

---

(٢٧) لە دەسنووسەکەی ژێرەوەدا نووسراوە «جەمیعی قەتار قەتارچیو» .

(٢٨) ئەبوو «بردنیە» بووایە .

(٢٩) لە دەسنووسەکەدا لەجیاتیی ئەم نوختانە ڕستەیەك هەبوو بە پێویست زانرا لابرێ .

(٣٠) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە «هەموو دەفعە» .

دێمه لاتان ، کاغەزێ ، خەبەرێ بێ بۆتان ئەنێرم . ئەمڕۆ وا چاك بیزاوه ئێوه له مەریوانا بن . . . [31] . هیچی نەوت ، ڕۆیی . ئێمەش دەمچەرمگمان کاکەحەمه بوو ، وتی : نژمار چونکه ڕەبتێکی به هەورامی‌یەوه هەیه ڕەزام نی‌یه تیا بەند بن . دەستبەجێ بارمانکرد بۆ دەرزی‌یان . حەقیقەت بۆ کەسێ که له باریکی‌و زەعیفیدا بووبێ به دەرزی ، دەرزی‌یان زۆر موناسبه ، ئینجا من‌و کاکەحەمه بووین به لازم‌و مەلزووم ، ئینتیزاری موقەددەراتمان ئەکرد که چۆن ئەبێ . هەر ڕۆژێ خەبەرێکی درۆ دەهات که شێخ له فلان جێگایه ، ئەمه ئەکا ، ئەوه ئەکا . ژن‌و منالْ دڵیان پێ خۆش ئەبوو . لەگەڵ ئەوەش که قوماندانی ئینگلیز به قووەتێکی زۆرەوه هاته پێنجوێن ئیعلانیکرد که شێخ (مجروحاً) ئەسیرەو ڕۆژنامەی ئێران له سنەو تەبرێز ئیعلانی کردبوو ، کەچی ئێمه بەو قسه ڕەسمی‌یانه باوەڕمان نەدەکرد . حەمەحسەینی درۆزن که پیاوی خۆمان بوو وه له قاسیدی‌و جاسووسی مەهارەتی بوو ، هەرجاره به ئومێدی بەخشش‌و نەفعی خۆی مژدەی ئەدا که شێخ له فلان جێگایه ، نەگیراوه . حەتتا دەفعەیەك وتی تەشریفی وا له سیوەیلدایه ، بووبووه مەسەلی «به زەڕەی کەر باوەڕ دەکەن ، به قسەی مەلا باوەڕ ناکەن» .

## گەڵباخی

گەڵباخی عەشیرەتێکی کوردە له ئەترافی سنه ، زۆر بەدەست‌و ئازا . (مع التأسف) ئەوانیش وەکو باقیی عەشیرەتانی کورد هەموو جەردەو

---

(31) له دەسنووسەکەی زێوەر خۆیشیدا ئەم نوختانه هەن .

ئەشقیان[٣٢] . چەند وەقت بوو حوکوومەتی سنە مەنعی شەقاوەتی ئەوانی پێ نەدەکرا . لەووەقتەدا موناسەبەتی بەینی ئینگلیزو ئێران زۆر خۆش بوو ، قونسلۆسێکی ئینگلیز هاتە سنەو بە پارەو ئەسلەحەو تەییارە ئەیتوانی موعاوەنەتی ئێران بکا . (ظاهراً) قەرار درابوو گەڵباخی تەنبیە بکرێت . ئێران لەسەر عادەتی خۆی بۆ هەموو عەشیرەتێ ئەمری‌کرد لەشکر بنێرن . شەوێ کە لە کانی‌سانان بووین پیاوی شەریفوددەوڵە بۆلای مەحموودخان هاتبوو و لەوێ بوو . لەپێش ئێمەدا جوابیان دابوو ، چونکە گەڵباخی قیسمێکی دەخالەتی بە مەریوان کردبوو هاتبوونە ناو مەریوانی‌یەوە ، فەقەت بە چوونی ئێمە سیاسەتی مەریوانی گۆڕا . حەزیان‌ئەکرد خدمەت بە حوکوومەتی ئینگلیزو ئێران بکەن ، بەڵکو ببن بە سەبەبی عەفوی ئێمە . هەتا ئێمە تەقسیم‌کراین پیاوەکەی والی نەڕۆیبووەوە ، هەر لە مەریوانا بوو .

لەگەڵ کاکەحەمە ڕۆژمان بە چایی ، بە قسەی خۆش ، بە خەیاڵی مەحاڵ بەسەرئەبرد . ڕۆژێ وتی من دیققەت‌ئەکەم ئەم مەریوانە ژنی جوانی تیا نی‌یە ، ئەمما یەکێکم دۆزیوەتەوە نەختێ لە ئینسان ئەکا ، وەئیللا باقی

(٣٢) بەداخەوە زیوەر کەوتووەتە هەڵەی ئەم حوکمە نارەوایەوە کە نیشانەی بێ‌ئاگایی‌یە لە باری کۆمەلایەتیی هەر گەلێك لە هەرکام لە قۆناغەکانی ژیانیا ، چونکە لە هەر خێلێکی هەر گەلێکی‌تری وەك کوردا نە خێلێ تێکرا جەردەو ئەشقیایەو ، نە بێ‌جەردەو ئەشقیایش ئەبێ . بوونی جەردەو ئەشقیا لە هەر خێلێکا بەسراوە بە سیستێمی خێلایەتی‌و دەرەبەگی‌و پاشکەوتنی کۆمەلایەتی‌یەوە . ڕاستەکەی تاوانی گەڵباخی ئەوە بووە کە لەئاست زوڵم‌و زۆری حوکوومەتەکانی ئێران‌و داردەستەکانیان بێ‌دەنگ نەبوون‌و بەربەرەکانێ‌یان کردووە ، وەك هەر لەم کتێبەدا لەم‌باسەدا دەرئەکەوێ .

هەموو وەکو داعبای کێوین ، حەزئەکەی نیشانت بدەم . ئەگەر کچ بێ نیکاحی ئەکەم . زۆرم لا جوانە . مەگەر کاکەحەمە بێخەبەر لە حاڵەتی ئەو ولاتە . ژنیشیان تووشی پیاو بێ سەلامی لێ دەکا . دوو سێ دەفعە سەلامی لێ کردبوو ، وای دەزانی کە حەزی لێ کردووە . جارێ منیشی لەگەڵ خۆی مونتەزیر کرد ، کە هات ببینم . هات ، دیم خراپ نەبوو . وتم باشە . وتی مەدحێکی بکە . لەبەر دڵی ئەو ئەم ڕوباعی‌یەم بە زوبانی ئەوەوە نووسی :

**چاو بازەکەی مەریوان هۆشی لە دەست فڕانم**
**دڵ بوو بە سەیدی چاوی ، ئەسیری ئەبروانم**
**سەرڕاڤی حوسنی ئەوم‌و ئەو هەروەکو جەواهیر**
**بەخوا منم لە دنیا قەدری تەواو بزانم**

لەواقیعا ناویشی (جەواهیر) بوو .

## لەشکری مەریوان بۆ سەر گەڵباخی

لەپێشا نووسیان کە پیاوی والی بۆ لەشکر هاتبوو . هەموو بەگزادە لە بالك کۆبوونەوەو مەحموودخانی هەورامیش هاتە ئەوێ . نەتیجە تەدبیریان وابوو چوارسەد سوارەو تفەنگچی لە قوماندەی هەردوو مەحموودخانا حازر بێ . لەپاش دوو ڕۆژ تەدارەکات بە ئومێدی ئەوە والی مەمنوون بکەن‌و قونسلۆس لە گوناهێ کە بوویانە عەفویان بکاو عەفوی ئێمەش داوا بکەن ، سواری ئەم دەنائەتە بوون کە لەناو عەشایرا مەقبووڵ نی‌یە کەسێ دەخالەتی بە کەسێ کرد ئیتر بچێ بەگژیا . گەڵباخی کە هاتبوونە مەریوان ،

له مەریوانی مەئیووس بوون . له هەموو لاوه کرایه ئێلجاری . روویان کرده گەڵباخی . ئەوانیش مودافەعەیان پیّ دەکرا ، ئەمما هەموو جاف که له کوێستان بوون ، ئەوانیش بوون به لەشکری والیو ، تەیارەش تەعقیبی ئەکردن . مەجبوور بوون دەخالەتیان کردو مالییات بدەنو رەددی مەزالیم بکەنو چەند ئاغایێکیان چووه شار (سنه) . لەپاش ئەم فەتحو زەفەره والی بۆ هەردوو مەحموودخانی نووسی دەبێ چەند رۆژێ بێنه شارەوه . موعتەمەدی خۆیو جەعفەرسانی هەورامیشی بۆ ئەمنیەتی ئەوان نارد سوێندو شەرتی زۆریان بۆ نواندن . به ئیقناعی چوونه شارەوه . (ساعةً) خانوویێکیان بۆ خاڵیو تەفریش ئەکەن . هەتا سێ رۆژ خدمەتێکی (فوق العاده)یان دەکەن . لەپاشا پیّیان دەڵێن لەشکرتان بڵاوبکەنەوه ، برۆنەوه . خۆتان هەتا خەڵاتو بەرات وەردەگرن لێره بن . ئیتاعەیان کرد . لەشکر هاتەوه . حەتتا کاغەزیان رۆژ بەرۆژ دەهاتو جارێ مەحموودخان نووسیبووی : «لشکر انگلیز از راه گاران و مریوان به کردستان میآید . . . [٣٣] هرچه لازم دارند جبرا نمیستانند . معامله خواهند کرد ، به ایشان بدهید . و کار رو به خوبیاست» [٣٤] .

پیاوێکیتر هاتەوه ، وتی مەحموودخانی هەورامی خەریکه ژن مارەئەکا . ئێمەش لەبەینی خۆفو رجادا بووین که ئەم لەشکری ئینگلیزه

---

(٣٣) دەسنووسەکه لەم شوێنەدا ئاگری جگەرەی کەوتووەتەسەرو هەندێکی لێ سووتاوه ، بۆیه دوو وشەی شوێنی ئەم بۆشاییەمان پێ نەزانرا .

(٣٤) واته : سوپای ئینگلیز له رێگەی گارانو مەریوانەوه دێ بۆ کوردستان . . . هەرچییەکیان پێویست بێ به زۆر نایستێنن ، مامەڵه ئەکەن ، بیاندەنێ . کار روو له باشییه .

له مەریوانەوە بێت بۆ ئێمە تەهلوکەیە . لەلایەکەوە دڵمان خۆش بوو کە لە سنە ئیش چاك ئەکرێت . لەپڕ خەبەر هات هەردوو خان حەبس کران ، نەگبەتیی ئێمە ئەوانیشی گرت . دڵخۆشیی خۆمان ئەدایەوە کە گۆیا هەموو ئیشی ئێران بۆ پووڵو پارەیە . چەند ساڵە مەریوانو هەورامان مالیاتیان نەداوە ، بە میقدارێ پارە نەجاتیان ئەبێ . شارەزا نەبووم کە ئێران تابیعی هیچ قانوونێ نییە ، نەمدەزانی کە ڕەئیسی مەملەکەت خۆی [٣٥] ڕەعیەتی خۆی تەسلیمی ئەجنەبی ئەکا موجازاتی بدا ، چونکە هیچ حوکوومەتێ لە داخلی خۆیدا جەزای ئەجنەبییش حەواڵەی ئەجنەبیی ساحێبی [٣٦] ناکا چجای ڕەعیەتی خۆی [٣٧] . شەریفودەوڵە هەردوو مەحموودخانی تەسلیمی قونسڵۆس کرد ، ئەویش خۆیو ئینسافی . . . . [٣٨] ئێمە بوون ، لە هەورامان بوون . لە هەموو کەشاکەشێ بێخەبەر بوون . جێگایان قایم بوو . شێخولئیسلام لە نەوەی سەییدی چۆڕ هات بۆ دیدەنی کوڕانی شێخو تەکلیفی کرد بە وەجهی تەفەڕڕوج بچین بۆ ئەو کوێستانەی لەپشت دێی چۆڕەوەیە . ئێمەش بە ئومێدی ئەوە ئیمراری وەقت بکەینو لە مەریوانییش ئەترساین کە بمانگرن تەسلیمی حوکوومەتمان بکەن ،

---

(٣٥) لە دەسنووسەکەدا بە قەڵەمێکیتر لەپاش (خۆی) پیتێکی (و) دانراوە . ئەوەم بەلاوە هەڵە بوو .

(٣٦) واتە : هاوڕێو برادەری .

(٣٧) بۆ نەڵێین ئەمە نیشانەی ئەوەیە دەوڵەتەکانی ئێران تائێستا هەرگیز کوردیان بە هاونیشتمان نەزانیوەو مامەڵەی بێگانەو دوژمنیان لەگەڵ کردووە ؟

(٣٨) لێرەشدا ، دوو سێ وشە ، لە ڕووەکەیتری دەستنووسەکەدا بەر ئاگری جگەرەکە کەوتووە ، کە لەودیویشەوە چەند وشەیەکی بەرکەوتبوو .

**شێخوئیسلامی مەریوان سەیید عەبدولقادری چۆڕی**

بەڵکو ڕەئیسیان بەربیی‌و ، لە هاتنی لەشکری ئینگلیزیش خۆڤمان هەبوو ، شەوێك بە ناوی زیارەتی چۆڕو تەفەڕڕوج هەموو بارمانکرد چووینە کوێستانی مەوعوود . (فی الواقع) دڵی خۆشی ئەویست ئەوەندە بەسەفاو فێنك‌و هەوادارو لە تەعەڕڕوز مەحفووز بوو . لەپاش دوو ڕۆژخەبەرمان بۆ هات لەشکری ئینگلیز ڕیجعەتی کرد ، لە ڕێی شارەزوورەوە گەڕایەوە . ئێمەش بارمانکرد هاتینەوە دەرزیان . ئەم ڕۆین‌و هاتنەوە بە قسە خۆشە .

# جەژنی ڕەمەزان

وتمان ڕۆژی حەرەکەت ڕەمەزان بوو . یانزە ڕۆژی مابوو . لە ئەحواڵی جەژن‌و ڕۆژوو بێ‌خەبەر بووین . شەوێ ئیعلانی جەژن کرا . (ع)[39] : ماتم زدەرا عید بود ماتم دیگر[40] . بەیانی فکری ماڵ‌و منداڵ ، یادی خزم‌و وەتەن‌و ڕەفیقان‌و پەرێشانیی خۆمان لەو حاڵەتەدا تەقریر ناکرێ ، ئەمما نەختێ لە جەژنەکەمان ئەدوێم کە نموونە بێ بۆ هەموو پەرێشانیمان . ئەو منالأنەی شێخ کە هەموو جەژنێك پێنج‌سەد شەش‌سەد کەس لە ماڵی ئەوان نانی ئەخوارد ، غەیری هەڵمی ئاگری سەماوەرەکەمان‌و دووکەڵی جغەرەی دەسمان نەبێ ، تەبەقەی هەوائیەی ڕاست ئێمە دووکەڵ‌و بوخاری تێکەڵ نەبوو . شێخ عارفی خەڵکی دەرزیان خۆی بە سەیید حیساب ئەکرد ، شەخسێکی عاقڵ‌و فەهمیدە بوو ، زۆر دەلاڵەت‌و تەسەللای ئێمەی دەکرد ، ڕۆژی جەژن هاتە لامان دانیشت ، لەپاش سەعاتێ ئەمری‌کرد لە ماڵی ئەوانەوە مەجمەعەیەك[41] نان هات ، قبووڵیی ساوەر بوو ، هەشت‌کەس میوانی ئەو مەجمەعەیە بووین .

لەگەڵ کاکەحەمە لەباتیی هەموو گەڕانی سلێمانی چووینە سەر ڕێگای (جەواهیر) لە مەڕ دۆشین بێتەوە ، جاربەجار لۆرەلۆرێکیشمان بۆ ئەکرد .

---

(٣٩) ع : میصرەع ، نیوە شیعر

(٤٠) واتە : خەفەتبار کە خەفەتێکی‌تری بۆ پەیدا بێ ، بۆی ئەبێ بە جەژن ، چونکە خەفەتە پێشووەکەی لەبیرئەباتەوە .

(٤١) مەجمەعە : سینی .

له ئاخردا مەعلووم بوو جەواهیریش مێردی هەیە . میرزا ئەحمەدی برای کاکەحەمە کاغەزمان بۆ نووسی کە لەگەڵ خۆی وەقتێ چوو بۆ سەقز بیبا بۆ (سەییدی زەنبیل) ، چونکە ئیشی مەخسووسی خۆی هەبوو دەچوو بۆ بانەو سەقز . لەوڕۆژانەدا مەجبوور بوو بکەوێتەرێ ، بەعەجەلە سوار بوو ڕۆیی .

## خەبەری شێخ

لەپاش ئەم هەموو شایعە درۆیانەو خەبەرە ڕەسمی‌یانە[٤٢] ، دەنگ بڵاوبوەوە شێخ هاتووەتە مەریوان ، وا لە (چۆڕ) . باز غولغولەی[٤٣] (ڕاستە) و (ڕاست نی‌یە) لەناوا پەیدابوو . بۆ تەحقیق حسین نازمو سەیید ئیبراهیم لە دزڵی‌یەوە هاتن بۆ مەریوان ، چوونە چۆڕ . شۆڕ شۆڕ هاتنەوە . نازانم ئەساسی ئەو هەموو شایعە درۆیانە چی بوو ! ئەتوانم بڵێم ڕاست لە ئێرانا نی‌یە . لەحزە لەحزە خەوفی بەگزادەمان بوو کە بمانگرن لەپێناوی خانەکانا[٤٤] . وە لە ئەحواڵی ئینقیلابی سلێمانی هەر ئانێ نەوعە بەیانێ نەقڵ ئەکرا . ژنێ هات وتی ماڵی ئێوە تالان‌کرا ، ئەمما هەموو منالان سەلامەتن . زۆر مەمنوون بووم لەم خەبەرە ، چونکە تالانی ماڵی من قەدرو قیمەتێکی‌وای نەبوو . ئەگەر بیشیبوایە تەئەسسوفم بۆ ماڵی دنیا نەدەخوارد . ئەمما خەفەتی کاکەحەمەو منالەکانی شێخ حەق بوو . نەقدو

---

(٤٢) لە دەسنووسەکەدا بەمجۆرەیە : «لەپاش ئەم هەموو شایعە درۆیانە خەبەر ڕەسمی‌یانە» . من بەمجۆرەم خوێندەوە کە نووسیومە .

(٤٣) باز : دیسانەوە . غولغولە : هەراو زەنا .

(٤٤) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «خانەکانە» .

جینس و ئەشیایان قیمەتی سێ هەزار لیرە زیاتر ڕۆیبوو . لەگەڵ ئەوەش زۆر سابیر بوون . ئەیانوت هەموو فیدای شێخ بێ . شێخ سەلامەت بێ .

بەیانی یەك دانیشتبووین . چامان لێ نابوو . لەپڕ قاسیدێ لە ڕێوە هات . سەلامی کردو دانیشت . هەموو کەوتینە مەراقەوە . ڕوومان تێ کرد : مژدەت پێ هەیە ؟ وتی بەڵێ . منیش شارەزای درۆی ئەم قاسیدە بووبووم . وتم ئەتوانی ئەمجارە درۆ نەکەی ؟ کە زانی من لەم ئێم ، هیچ قسەی نەکرد . کاغەزێکی لە باخەڵیا[٤٥] دەرهێنا دای بە کاکەحەمە . هەموو چاومان ئەبڵەق بوو چ خەبەرێ زوهووری کرد ؟ خەیاڵمان وابوو لەسەر نەوعە شایعەیەك شێخ چووەتە ئەترافی سەقز . قاسیدەکەش سەقزی بوو . لەپاشا لە ناوچەوانی کاکە بەشاشەت دەرئەکەوت . ڕووی کردە ئێمە وتی باش ئەبێ . عادەتی کاکەحەمە وابوو حەزی ئەکرد هەموو ئیشێ مەکتووم بگرێ . کاغەزەکەی دا بە من ، خوێندمەوە . شێخ عارفی سەقزی بۆ شێخ ڕەئووفی نووسیبوو : (بلاتوقف) دێن بۆ سەقز ، سەرو ماڵ تەعەللوقی بە ئێوەوەیە ، بەندبوونتان (قطعیا) قوبووڵ ناکەم . ئێرە قۆناغی شێخەو بەخووسووسی دەعوەتی منو کاکەحەمەیشی کردبوو . وەکوو عەجەم وتوویانە «خودم بە بصرە میرفتم پول کمی نداشتم»[٤٦] ، ئەو مژدەیمان بەقەدەر هەموو دنیا پێ خۆش بوو و قاسیدەکە چای خواردەوە . عەینی کاغەزێکی وەهاشی بۆ شێخ لەتیف پێ بوو . ڕووی کردە دزلی .

---

(٤٥) ئەبوو «باخەڵی» بووایە .

(٤٦) واتە : خۆم بۆ بەسرە ئەچووم ، پارەیەکی کەمم نەبوو . یا ئەگەر (کمی) بە (گمی) بخوێنینەوە ، واتە : پارەی بەلەمم نەبوو . هەرچۆنێ بێ من تێنەگەیشتم ئەم قسەی نەستەقە چۆن بۆ ئەم شوێنە دەست ئەدا .

ئێمەش جوابی کاغەزمان حازر کردبوو ، نووسیبوومان هێندێ ئیشمان هەیە . چەند ڕۆژێکی تر حەرەکەت ئەکەین . مەقسەد لەم تەئخیرەش : ئینتیزاری جوابی میرزا ئەحمەدمان دەکردو بە ڕەزای بەگزادەکان برۆین . ئەوشەوە بە هەزار غائیلە ڕۆژمان کردەوە کە قاسید بێتەوە . بەیانی تێفکرین دوو سواری پیاوی خۆمان هات کە تاقمی دزلی ئەوا بەکۆچەوە هاتن . ئایشەخان دەفەرموێ ئەوانیش بارکەن . لەم خەبەرە زۆر موتەحەییر بووین . نەمانزانی کوتووپڕ وا بارئەکەن . لەو وەقتەدا خوشکی شێخ زۆر نەخۆش بوو ، وە کاکە حەمە لەبەر قەرەباڵغی نەیدەویست لەگەڵ ئەوان بڕوا . نەخۆشیی خوشکی شێخی کرد بە بیانوو ، وتی ناتوانێ سوار بێو نابێ بەتەنها بەجێ بمێنێ ، ئەوان خوا حافیزیان بێ ، ئێمە لەپاشا دێین . سوارەکان خەبەریان بردەوە . ئایشەخان باوەڕی نەکرد . شێخ ئیبراهیمی نارد ، ئەوانیش ئیقناع کران ، ڕۆینەوە . شەوێ ئەوان لە باللك بوون ، بەیانی لە ڕێی سەرشیوی سەقزەوە بەناو هەموو عێلی جافا حەرەکەتیان کرد . میرزا ئەحمەد خەبەری نەبوو . بەهیە خان زۆر مەراقی ڕۆینی بوو چونکە وای دەزانی لە سەحرای کەبیرا پەکیان کەوتووە . حەقیقەت فکری باش بوو ، چونکە وەحشیی دەشتی سەحرای کەبیر کە گۆشتی بەنی ئادەم ئەخۆن ، لە موعامەلەی مەریوانی چاکتر بوو . بە مەفادی (وأبوا أن یضیفوهما) میوانداریشیان نەدەکردو تەماعی ماڵیشمانیان دەکرد . خەبەرمان زانیبوو کە فکریان خرابە . لەپاش دوو ڕۆژ کە تاقمی دزلی ڕۆیی ، ئێمەش بارمانکرد بۆ تەرەفی بانە . شەو چووینە (قەلا) . ئاساری حوکوومەتی قەدیمی ئێرانو باغو باغاتی مابوو . ئەوشەوە وەك حاکمی ئێرانی کە یەکێکی بەردەست بکەوێ ، چۆن خەوی لێ دەستێنێ کە

مەجبووری بکا بە تەحویلی پارەی جەریمە ، مێشوولەش خەوی لە ئێمە سەند . ڕوباعی یەکم دانا ئەم میسرەعەم لە خاتردا ماوە :

**عیلاجی دەردی مێشوولە ، ئەگەر خوا حەزبکا ، بایە**

لە زوڵمەتی شەو ، لە عەزابی مێشوولە ، لە ئەندێشەی ڕێ ، بە تولووعی سوبح نەجاتمان بوو ، چونکە چەند سوارێکی شێخ قادر هاتن بە ئیشی خوسووسی ، بوون بە واسیتەی موحافەزەی ڕێگامان . لەگەڵ ئەوان کەوتینەڕێ لە قەڵاوە . هەدەفمان شار[47] . . .

. . . . شەربەو کوندەمان پڕ کرد . لە لقە وشکی بێ ئەو شیوە ئەوەندەش دارمان پەیداکرد هەتا بەیانی گڕی ئاگرمان ئەمبەرو ئەوبەری شاخی گرتبوو . چامان دەمکرد . ماحەزەرێکمان[48] سازکرد ، بە ئەنواعی قسەی خۆش ڕامانبوارد . بەیانی بۆ بانە بارکرا . هەتا نزدیکی نیوەڕۆ بەناو نزارو دارستانی پرسێبەر[49] بێ غائیلە ڕۆیین . ساعەتێکی مابوو بۆ شار ، لە قەراغ چەمو ئاوێکی سێبەردار خستان . فکر وابوو بە شەو بچینە شارەوە . نەڕۆیین هەتا پاش عەسر ، مەشغووڵی چاڵێنان بووین ، چەند سوارێ دەرکەوت . وامانزانی شێخ قادری برای شێخە . هاتنە پێشەوە . شێخانی بەرزنجەیی بوون کە ئەوانیش وەك ئێمە دەربەدەر بوون ، لە (هەنگەژار)ا[50] قوبووڵ کرابوون ، ڕەئیسیان سەیید ئەحمەدی حاجی

---

(٤٧) لەم شوێنەدا لاپەڕە (٣٣) و (٣٤)ی دەسنووسەکە فەوتاوە .

(٤٨) ماحەزەر : ماحضر ، ئەوەی هەبوو ، ئەو خۆراکەی هەمانبوو .

(٤٩) ئەبوو «پرسێبەردا» بووایە .

(٥٠) زێوەر لێرەداو پاشانیش (هەنگەژار)ی نووسیوە ، بەڵام کاك موحەممەدی وەستا ئەورەحمانی بەرگدروو کە لە سولەیمانی دائەنیشێ و شارەزای ناوچەکەیەو ناوی ئەو دێهاتانەی ناوچەی سەقزو بانەی بۆ ساغکردمەوە کە لەم یادداشتەدا هاتوون ، ئەڵێ «هەنگەژاڵ»ە .

مامەند بوو . لەپاش زۆر بەیانی تەئەسسوفو تەئەسسور بەحسی پیاوەتیی ساداتی هەنگەژاری کردو خەبەریشی بە ئێمە دا کە شێخ قادرو ماڵو منالی نەقیب هەموویان لەلای ڕۆستەم خانن . ئێوەش بچنە ئەوێ . مەحموودخانی حاکمی بانە ئەو پەنایە نی یە کە زانیوتانە . قەدەرێ لەلامان دانیشت ، ئینجا دوعاخوازیی کرد ، ڕۆیەوە بۆناو خێڵی خۆی . ئێمەش کەوتینەڕێ . وەقتی مەغریب داخلی بانە بووین . حەمەتاڵ پیاوی ڕۆستەمخان لەپێش ئێمەدا میوانیی شێخقادرو منالانی نەقیبی کردبوو ، تەعریفمان بیستبوو ، ڕوومانکردە ماڵی ئەوان . ئەگەرچی خۆی لە ماڵ نەبوو . ئەمما لە تەرەفی براو کەسوکاری بەنەوعێ خزمەتیان کردین ، مەفتوونیان بووین . کە ڕۆژ بووەوە لەگەڵ کاکەحەمە چووینە سەیری بازاڕو قاوەخانەو کاروانسەراکانی بانە . تەماشای وەزعی شارمان کرد کە لە شەڕی ڕووسو عوسمانیدا وێرانو سووتابوو . تازە خەریکی تەعمیرات بوون . میقداری سەدوپەنجا ماڵێك جەمع بووبووەوە . شارێکی خۆش ، مەنزەرەیەکی دڵگوشای هەیە .

بانە مەرکەزی حوکوومەتە . قەریب بە سەدوهەشتا دێ تابیعەتی . ئەویش بلووکێکە لە بلووکاتی کوردستان . ئیدارەی حوکوومەتی بەدەست بەگزادەوەیە . هەتا زەمانی یۆنسخان بوو بەتەواوی بانە لەبەینی بەگزادانا[٥١] بەشنەکرابوو . کە واقیعەی یۆنسخانو حاجی نائیب ڕوویدا هەرکەس ببوایە بە حاکم مەجبوور بوو کە تەرەفدار زۆر بکا . ئەو تەرەفدارەش بە دێو خەلاتو بەرات ڕازی ئەبوون . بەو واسیتەوە زۆر

---

(٥١) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە «بەگزادانە» .

ورده بەگزاده بوون بە پیاوو زۆریشی مەحو بووەوه[٥٢] ئەمما حاکمی لەبەینی ئەولادی یۆنس‌خان یا حاجی نائیب خاریج نەدەبوو. ئەمما بە واسیتەی ئیقتیدارو کیفایەتی ڕۆستەم‌خان‌و فەرەج‌خانی برای (بعضاً مستقلاً) وه (بعضاً مشترکاً) موداخەلەی حوکومەتیان ئەکرد. وەقتی موواسەلەتی[٥٣] ئێمه ڕۆستەم‌خان‌و مەحموودخان هەردوکیان حاکم بوون. یەکی وەکیلێکیان له شارا بوو. لەبەر ئەمین نەبوون لە یەکتری خۆیان بەیەکەوه له شاردا دانەدەنیشتن. بەگزادەی بانه حەقیقەت (بالعموم) شەجیع، جەسوور، سەخی، بەتەربی‌یه، بەئوسووڵ، بەدیرایەتن. ئیتتیفاقیان لەبەینی خۆیانا ببوایه حاکمی مەریوان‌و سەقزیش ئەبوون. نیفاق وای لیٚ کردوون پژدەری، مەریوانی، سائیره موداخەلەی ئیشی بانه ئەکا. ئەوەش عەلامەتی مەحوی تائیفەیه. بە واسیتەی ئەو ئیختیلافەوه، ئێرانیش جاربەجار مالیاتێکیان لیٚ دەستێنیٚ. ئەگەر له بەگزاده هەمڕاهی بە حوکومەتی ئێران نەکا، ناتوانیٚ گوزەر بە بانەدا بکا. بەڵیٚ:

«کورد له هەرجیٚ که بیٚ میللەتی خۆ خۆره»

## ئەحواڵی ئیقتیسادی

بانه قەسەبەیەکی بەواریداته. حاسلاٚتی توتن، مازوو، کەتیره، بنێشت، گەزۆ، دارو خەڵوزه. ئەنواعی میوەی نایابی هەیه. له

---

(٥٢) ئەبوو بیوتایه «زۆریشیان مەحوبوونەوه».

(٥٣) مووامسەلەت: گەیشتن.

کیفایەتی خۆی زیاتر گەنمو جۆو هەرزنی لێ دادەچێنرێ . لە بەعزێ دێهاتیشیا چەڵتووك ئەکرێ . ئەنواعی ڕاوو شکاری زۆرە . قیسمی موهیممی ڕاویان ڕاوەکەوە . وەقتێ کە پۆلپۆل کەو ڕوودەکاتە کوێستان ، ڕێگای مەخسووسی ئەو پۆلە کەوانە تفەنگچیی لێ دادەنیشێ . پیاویوا هەیە ڕۆژی پێنجسەد کەو ئەکوژێ . ڕاوەکەو لە بانەدا دەوری دائیمە(٥٤) . چوار فەسلێ هەیە . ئەهالی زۆر کاسبو فەقیرن . فەقیرییان بەسەبەب غەدری بەگزادەو مەحموود خانەوەیە . مەحموودخان دەڵێن بە تاعەتە ، بە نانو خوانە ، ئەمما چایێ کە لە مەجلیسی ئەودا دەمئەبێ هەموو خوێناوی دڵی ڕەعیەتە . لەم بەیاناتە مەقسوودم زەمو مەدحی کەس نییە . هەرچی ڕاستەو بە چاوی خۆم دیومە نووسیومە . (واقعاً) موعامەلەی مەحموود خان لەگەڵ سادات وەکوو ئیبنوزیاد وابوو ، لەو تەفسیلاتە گورێز ئەکەم . حاڵەتی حوکوومەتی بانەیی بەیان ئەکەم .

ڕێگام کەوتە دێیەك تەعەللوقی بە مەحموودخان بوو ، لێم پرسین هەر ساڵێ چەند بار تووتنتان ئەبێ ؟ وتیان هیچ . وتم ئەم هەموو بەراوانە چییە کراوە بە تووتن ؟ وتیان بۆ مەحموودخانی ئەکەین . وتم حەقە ئاوتان ناداتێ ؟ وتیان پار هیچی نەداینێ . وتم کەوابێ بۆچ تووتن ئەکەن ؟ وتیان

---

(٥٤) دەوری دائیم : حیسابێکی ئاسمان شناسەکانی کۆنە ، بە زانینی ، سەرەتای هەموو مانگێکی ساڵ بۆ هەمیشە ئەزانرێ . ڕووی شوبهاندنی ڕاوەکەوی بانە بەم دەوری دائیمە ئەوەیە پۆلە کەوی ئەو وڵاتە بە درێژایی ساڵ بەپێی وەرزی گەرماو سەرما لەنێوان ناوچەی بەرڕۆژو نسێدا لە هاتوچۆدانو ڕاوچی ئەزانن لەکوێنو لە هەرلایەك بن ڕاویان ئەکەن .

کوێر هەتا ئەمرێ بەتەمای چاوە . دەڵێین[٥٥] پار نەیدایینێ بەڵکو ئەمساڵ ڕەحمی بێ یا حاکمێ بێ نەتوانێ ئەم غەدرە بکا[٥٦] .

یەکێکی تر لە ئەهلی ئەو دێیە وتی : مەلا ، مەلا ، ئەمساڵ دوازدە هەزار تومەنی لەم دێهاتی بانەیە بۆ پێشکەشی شەریفوددەوڵە سەندووە . لەم پیتاکە ڕەعیەت وای لێ هاتووە لە ڕووس کە هەموو بانەی وێران کرد ئەوەندە زەرەرمان نەدیوە . تیجارەتی بانە زۆر موهیممە . واسیتەیە لە بەینی سولەیمانی و سەقزدا ، وەك بەندەر وایە . ئەهلی کەسەبەش هەریەکی مەربووتی ئاغایێکە ، حورڕییەتی تەواویان نی یە . ئاساری موعایەشەی یۆنس خانە کە عولەما لەناویانا زۆر بەقەدرو حورمەتە ، غەیری مەحموودخان ئەکسەری بەگزادە تەرەفداری مەکتەب و تەحسیلی تازەن . ئەمما خان زۆر موتەعەسسیبە ، وەئیللا بانە لازم بوو مەکتەبێکی ڕوشدیی تیا بوایە ، ئەهالی و ڕەعیەتیان لە سەد پێنجی خوێندەوارە ، تەنها کاغەزێ ئەنووسن و دەخوێننەوەو بەس .

## جوغرافیای تەبیعی

بانە (شمالاً) شاخی کەلی خان ، (جنوباً) شاخی سوورکێو ، (شرقاً) چەمی قزڵجە ، (غرباً) ئاوی کەڵوێ . نەهری گەورەی چەمی (بلەکێ)یە ئەرژێتە ئاوی کەڵوێ کە زابی سەغیر تەشکیل ئەکا . ( طبیعةً) هەموو بانە دارستانە . هاوین زۆر فێنکە ، زستانیش لەبەر دار زۆری سەخڵەتی ناکێشن .

---

(٥٥) لە دەسنووسەکەدا «دەڵێن» نووسراوە .

(٥٦) لە دەسنووسەکەدا «بکە» نووسراوە . واتای ڕستەکە ئەوەیە بەڵکو ئەمساڵ حوکمڕانێك لەلاوە بێت نەهێڵێ مەحموودخان ئەو ستەمەی ساڵانمان لێ بکا .

شێخ‌قادر خەبەری زانی کە گەیشتووینە بانە . جوابی نارد بەند نەبن بێنە (ساوان) کە دێی ڕۆستەمخانەو ماڵیشی لەوێ ساکنە . بارکرا ، چووینە دێی (شوێ) ، زۆر خۆشمان هاتە بەرچاو . لەوێ قەرارمان وابوو لەوێ ئیقامەت بکەین چونکە تەشریفی شێخ‌قادرو ماڵی نەقیب لە ساوان بوون . ئێمەش خۆمان دەپاراست کە بەتەواوی ڕۆستەمخان دوچاری مەسرەف ببێ . لەگەڵ ئەوەش بێ‌فائیدە بوو قوبووڵی نەدەکرد . ئێواری کورانی خۆی لە خدمەتی شێخ‌قادرا نارد مەنزڵ موبارەکیی کردو ، دوو سێ ماڵ پیاوی شێخ‌قادریشمان لەگەڵ بوو هەر ماڵی ناردە دێ‌یەكو حوکمیشی کرد منالأنی شێخ بچنە ساوان لای سەلمەخانو حەفسەخان ئیقامەت بکەن . (مجبوراً) نەقڵی ساوان بووین . غەیری تاقمی دزڵی (عموماً) لە ساوانا کۆبووینەوە . تاقمی دزڵی‌یش وەك خەبەرمان زانی بەناو عێلی جافا بەحورمەتو قەدرێکی تەواو دەچنە (سەردەرە) کە دێی شێخ ڕەئووفی برای حاجی شێخ عارفی سەقزە . پیاوەتیی شێخ ڕەئووفو ئینسانیەتێ کە ئەو بەجێی‌هێنابوو لازمە لە دەفتەری خوسووسیدا قەیدبکرێ ، وە حاجی شێخ عارفو شێخ جەلالی کوری بەئیستیقبال هەتا سەردەرە دەچن . شێخانی سەقزی سەد قات لە ئیقتیداری خۆیان زیاتر ئینسانیەتیان نواندبوو . تەنها منالەکانی شێخ دێن بۆ شار . باقیی پیاوان لەلای شێخ ڕەئووف ئەمێننەوە . هەموو مەسرەفیان ئەو بۆی‌کردبوون (جزاه الله) .

لە ساوانا بۆ ئەمینیو خواردنو خواردنەوەو ئیستیراحەت لە بەهەشتا بووین . لە قەسیدەیەك کە مەدحی ڕۆستەمخان بوو ئەم چەند شیعرەم لە خەیالا ماوە ، نموونەی فیداکاریی ڕۆستەمخانە :

ای فلك كنگرهٔ قصر تو بی‌بنیان‌است
حرکات تو به عکس نظر انسان‌است
آل حیدر شود از دست تو مظلوم و اسیر
سلطنت قسمت غدار بنی مروان‌است
باز با آل نبی از چه عداوت سازی
ز چه رو مرتبهٔ غدر تو بی‌پایان‌است
آنکه وقعی ننهد گردش و اوضاع ترا
بحقیقت نگری همت رستم خان‌است
بندهٔ آل نبی ، مخلص سادات کرام
درگهش ملجأ هر بی سر و بی سامان‌است
رستم زابلی با غیرت او همچو جهود
حاتم طائی به خوان کرمش مهمان‌است[٥٧]

---

(٥٧) مەعنای ئەم شیعرانە بەم‌جۆرەیە :
گەردوون ! تیراوێژی کۆشکی تۆ بێ‌بینایە
هەڵس‌وکەوتت بەپێچەوانەی بۆروانینی ئادەمزادەوەیە
نەوەی عەلی بەدەستتەوە دیل‌و ستەمدیدەیە
پاشایەتی‌یش بەشی بەنی‌مەروانی غەددارە
ئەوە لەسەرچی وا سەرلەنوێ لەگەڵ ئەولادی پێغەمبەر دوژمنایەتی ئەکەی ؟
بۆ پلەی غەدرت برانەوەی بۆ نی‌یە ؟
ئەوەی هیچ بایەخێ بە هەڵس‌وکەوت‌و چۆنیەتیی تۆ نەدا
ڕاستت بوێ تەنها هیممەتی ڕۆستەم‌خانە
بەندەی ئالی پێغەمبەر ، دڵسۆزی سەییدە پایەبەرزەکانە
دەرگای ، پەنای هەموو بێ کەس‌و بێ‌دەرو نەدارایەکە
ڕۆستەمی زابولی لەئاست غیرەتی ئەوا وەك جوو ترسنۆکە
حاتەمی تەی میوانی سفرەو خوانی بەخشندەیی‌یەتی .

لازمە نەختێ لە ئەحواڵی عائیلەی نەقیب بەحس بکەم کە چۆن گەیشتوونە (ساوان) . لە تەحقیقاتێ کە خۆیان گێڕایانەوە[٥٨] ڕۆژێ کە ئێمە لە سولەیمانی ڕامانکرد ، سەلمەخانو حەفسەخان پەنادەبەنە ماڵی مەجید ئەفەندی لە کانی ئاسکان .

(مەسەل) . . .[٥٩] کە یەکێ بوو لە خدمەتکاری بەردەستی مەئموون نەقڵی کردووە دەڵێ ڕۆژێ لە خدمەت خەلیفەدا بووم چەند حەبسێکیان بە زنجیرو دەستبەستراوی لە شاری شامەوە هێنا بۆ حوزوورو خەلیفە کاغەزی والیی خۆی کە لە شام بوو دەیخوێنێتەوە ، لەپاشا ئەمرئەکا یەکەیەکە بردیانن بۆ زیندان . حەبسێکیان مایەوە . دەڵێ خەلیفە ڕووی کردە من فەرمووی ئەم حەبسەیان بەرە لای خۆت لە ماڵی تۆدا خۆت ئاگەهداریی بکە ، ئەمنیەتم لە کەس نی یە وەکوو تۆ ، بە زامنی ئەوا تەسلیمی تۆم کرد هەتا سبحەینێو ، منیش بە (نعم ، یا امیرالمؤمنین) جوابم دایەوە . دەستبەجێ حەبسەکەم هەڵگرت بردمە ماڵی خۆمان ، لە خۆفی خەلیفە نەوەك ئەم حەبسە فیرار بکا من لەباتیی ئەو ئیعدام بکرێم خۆم بووم بە نۆبەتچی ، باوجوود چوارپەلی بە زنجیرو پاڵەهەنگ[٦٠] وا قایمکرابوو بەستەزوبانە نەیدەتوانی جمبدا . شەو کە هات بۆ خاتری خەوم لێ نەکەوێ لەگەڵ حەبسەکە دەستمکرد بە قسەکردن ، لێم پرسی تۆ خەڵقی کوێی ؟ وتی شام . وتم «بارك الله في هذه البلدة» . وتی بۆچ ئەم دوعا بەدڵە

---

(٥٨) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «گێڕایەنەوە»

(٥٩) شوێنی ئەم نوختانە لە دەسنووسەکەی زێوەر خۆیدا بە سپی یەتی بەجێهێڵراوە ، بەڵام وەك پاشان دەرئەکەوێ ئەو ناوەی ئەبوو لێرەدا بنووسرێ «مەسروور»ە .

(٦٠) پاڵەهەنگ : پالاهەنگ ، هەوسار .

بۆ شامدەکەی ؟ وتم لە شامدا شەخسێك بووە بە باعیسی حەیاتم‌و چاکەی زۆری لەگەڵ من کردووە ، دائیما پرسیاری ئەو زاتە دەکەم‌و حەزدەکەم خەبەرێکی بزانم بەڵکو موکافاتی بدەمەوە . وتی نیشانەی بڵێ‌و بەیانی چاکەکەی بکە ، بەڵکو من بیناسم ، خەبەری ئەوکەسەت پێ بڵێم . وتم من لە شامدا یەکێ بووم لە مەئموورانی حوکوومەت . ڕۆژێ ئەهالی هەیەجانی کرد ، قیامیان لە حوکوومەت کرد ، لە هەموولاوە دەست‌کرا بە کوشتاری مەئمووران‌و تالانی ماڵیان . حوکوومەت لە موقابەلە پەکی‌کەوتبوو . منیش دەستم لە ماڵ‌و تالان‌و عەبدو جاریە هەڵگرت ، فیرارم‌کرد . چوارکەس لە یاخی‌یەکان بە شیری ڕووتەوە شوێنم‌کەوتن ، بە هەموو کۆلانی شاما ڕایانفراندم ، نەجاتم نەبوو لە دەستیان ، لە پەل‌وپۆو ڕاکردن کەوتبووم . گەیشتمە کۆلانێ ، ژنێ لە بەردەرگایەك ڕاوەستابوو ، بانگم‌کردە ژنەکە (أغثنی أغاثك الله)[٦١] وتی (أدخل ، لابأس علیك) یەعنی وەرە ژوورەوە مەترسە . پێشم‌کەوت بردمیە هۆدەیەکی پشت دالان‌و خۆشی لە بەرقاپی هۆدەکەدا ڕاوەستا . منیش دڵەکوتکێم بوو کە ئیستا بێنە ژوور یا نەیێن[٦٢] . لەم‌ترسەدا بووم هەر چواریان هاتنە حەوشی ماڵەکە ، هۆدە بە هۆدە گەڕان هەتا نۆبەت هاتەسەر ئەو هۆدەیەی کە منی لێ بووم . هاتن بۆ ئەوێ ، ژنەکە دەستی‌کرد بە قیژەو هاوارو قسە پێ‌وتنیان کە ئێوە بێگانەو نامەحرەمن بۆچ دێنە سەر هۆدەی ژنان ؟ یاخی‌یەکان لەم زریکە زریکە گەڕانەوە ڕۆیشتن . ئینجا ژنەکە ڕووی‌کردە من وتی بەتەواوی دڵت

---

(٦١) واتە : فریام‌کەوە ، خوا فریات‌کەوێ ، ئەبوو «أغیثینی» بووایە چونکە قسە لەگەڵ ئافرەتدا ئەکا .

(٦٢) لە دەسنووسەکەدا وا نووسراوە : « . . . یا نەدین» .

ئەمین بێ نەجاتت بوو (الحمد لله) . خۆلاسە چل شەو لە ماڵی ئەو پیاوەدا مامەوە هەتا فیتنەو هەرا نەما . ڕۆژ بە ڕۆژ خزمەتیان زیاتر کردم . کە مەعلووم بوو شار ئەمینبووەتەوەو حوکوومەت دامەزراوە چوومە دەرەوە . هەرچەند هەوڵ‌و تەقەلامدا نە عەبدم مابوو نە کەسم مابوو نە ماڵ . بە مەئیووسی هاتمەوە ماڵەکە . ئەوانیش هەر دڵخۆشی‌یان ئەدامەوە . لە ئاخردا پێم‌وتن کە قافڵەی بەغداد کەوتەڕێ خەبەرم بدەنێ دەڕۆمەوە بەغداد . هەموو ڕۆژێ ساحێب‌ماڵەکە دەچوو پرسیاری بۆ دەکردم ، هەتا ڕۆژێ مژدەی بۆ هێنام وتی سبەینێ کاروانی بەغداد دەڕوا ، حازربە تۆش لەگەڵیان بڕۆ . دوعای خێرم بۆکردو لە دڵدا دەموت ئیلاهی من چۆن بڕۆم نە پارەم هەیە نە نان نە ئولاغ . چل ڕۆژ ڕێگا چۆن بگەمە بەغدا ! ئەو ڕۆژەو[٦٣] ئەو شەوە بەو غائیلەوە بووم . بەیانی لە بازاڕ هاتەوە وتی برادەر هەستە ئەوا[٦٤] قافڵە کەوتنەڕێ . منیش بە ناعیلاجی ڕاست‌بوومەوە . خۆی‌و ژنەکەی ئەم‌لاو ئەولایان گرتم ، بوغچەیەکیشیان لە بن‌باخەڵا بوو . لە ڕێگا هەر غایلەم دەکرد هەتا گەیشتینە کاروانەکە . ڕوانیم عەبدێك‌و ئولاغێکی سواری هاتە بەردەمم ، وتی سواربە . مەگەر بۆ خۆم ئولاغیان حازرکردبوو و عەبدێکیش بۆ خزمەتی ڕێگام بە بارگەیێکەوەو دە دەست ئەلبیسەو چەند سندووق ئەشیای خواردنی[٦٥] بەجوێ بارکرابوو ، وە میقدارێ پارەش لە کیسەیێکدا بوو . ئەمانەیان هەموو تەسلیم‌کردم ، بە ڕووی خۆش بە ئیزهاری مەعزەرەت لە قوسوور قسەیان لەگەڵ کردم‌و

---

(٦٣) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە «ئەورۆژو» .

(٦٤) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە «او» . دیارە هەڵەیەو مەبەست «اوا – ئەوا»یە .

(٦٥) خواردنی : خواردەمەنی .

ڕەوانەیاز کردم . لەوساوە کە هاتوومەوە لە ئیشی خەلیفەوە ئالاوم ، نامپەرژێ خەبەری ئەو ساحێبماڵە بزانم بەڵکو حەقی چاکەی بدەمەوە .

مەسروور[٦٦] ئەڵێ کە ئەم قسانەم کرد حەبسەکە گوێی گرتبوو هەتا ئاخری ، لەپاشا وتی زۆر حەزدەکەی ئەو ساحێبماڵەت نیشانبدەم ؟ وتم ئەڵبەتە . وتی ئەو ساحێبماڵە منم . وتم چۆن ؟ نیشانی هەڵدا ، ئیسباتی کرد کە خۆیەتی . منیش لێم مەعلووم بوو کە ڕاستئەکا . دەستبەجێ بەوشەوە ناردم ئاسنگەرێکم هێنا بە چەکوش زنجیرو تەوقی هەموو شکاند . لەگەڵ خۆم دامنا ، خواردنیم بۆ هێناو عوزرخواهیی زۆرم کردو ، سەبەبی حەبسیشی کە سوئالمکرد ، وتی واقیعەیەك وەك واقیعەی زەمانی ئێوە دووبارە ڕوویدا . حوکوومەت منی موتتەهەم کرد . ئەوا لەگەڵ چەند کەسێ ڕەوانەی ئێرا[٦٧] کراوینو لێم مەعلوومە خەلیفە ئیعدامم ئەکا چونکە لەنەزەر ئەودا گوناهم گەورەیە . ئەگەرچی لەم مەسئەلەدا بێخەبەرم . وتم مەترسە ، تۆ خوا حافیز بڕۆ ، با خەلیفە من ئیعدام بکا لەباتیی تۆ . وتی قابیل نییە ناڕۆم . هەتا خەبەری تۆ بەتەواوی نەزانم ، ناڕۆم . زۆرم ئیلحاحکرد ، جلوبەرگ ، تۆشەم بۆ هێنا ، هەتا قەراغ شار لەگەڵی ڕۆیم . لەوێ ڕاوەستا . وتی ناڕۆم ، بزانم مەسئەلەی تۆ چیی بەسەر دێ . ئەگەر ئیجاب بکا خۆم دێمە حوزووری خەلیفە . ناچار ڕازیبووم . گەڕامەوە[٦٨] ماڵەوە . هەر تەفەککورم ئەکرد هەتا ڕۆژ بووەوە .

---

(٦٦) وا دەرکەوت ناوی کابرا (مەسروور) بووە . لە سەرەتای قسەکەدا ، زێوەر ناوی ئەم کابرای نەنووسیوەو شوێنەکەی بە سپییەتی بەجێهێشتووە .

(٦٧) ئێرا : ئێرە . لە دەسنووسەکەدا وا نووسراوە . لە هەندێ ناوچە وائەڵێن .

(٦٨) دەسنووسەکەدا نووسراوە : «گەڕامە» .

تاریك‌و ڕوونی بەیان بوو . پیاوی خەلیفە هاتە ماڵی ئێمە وتی خەلیفە ئەمری فەرمووە لەگەڵ حەبسەکە بچنە حوزوور . خۆم بەتەنها لەگەڵ پیاوەکە ڕووم‌کردە ماڵی خەلیفە ، تەماشام‌کرد خەلیفە لەسەر بەرماڵ دوعاو ویردی ئەخوێند . کە چاوی بە من کەوت حەبسم لەگەڵ نەبوو ، وتی وەڵلاّ هەر بڵێی فیراری کردووە لە گەردنت ئەدەم . وتم ئەی (أمیر المؤمنین) ئیستیرحام ئەکەم حیکایەتی خۆم‌و حەبسەکەم بەیان‌بکەم ، لەپاشا هەر نەوع ئیرادە بفەرمووی (سمعا وطاعة) . فەرمووی قسە بکە . منیش ماجەرای بەینی خۆمان لە ئەووەڵ‌و ئاخر بۆم نەقڵ‌کرد ، هەتا ئاخری گوێی لێ ڕاگرت‌و سەری‌دانەواندبوو ، گوێی لە قسەکانی من بوو . لەپاشا سەری هەڵبڕی فەرمووی ئێستا لەکوێ‌یە ؟ عەرزم‌کرد لە قەراخ شار ئینتیزاری خەبەری من ئەکا . فەرمووی ئەمیشی لە خدمەتەکەی گەورەترە کە تۆی بەجێ‌نەهێشتووە . کەوابێ تۆ نەتزانیوە موکافاتی بدەیتەوە ، بچۆ خەبەری بۆ بەرە کە عەفوم‌کرد ، بیهێنە بۆلای خۆم من لەباتیی تۆ موکافاتی بدەمەوە . (ساعة) ڕام‌کرد مژدەم بۆ برد کە عەفو کرای .لەگەڵ خۆم هێنامە خزمەت خەلیفە . خەلیفە بەمەرحەمەت قسەی لەگەڵ کرد . لە مەجلیسا دایناو لەگەڵ خۆی تەعامی پێ‌خوارد . لەپاشا دە عەبد ، دە جاریە ، دە ئەسپ ، دە ئێستر ، دە کیسە پارەی پێ ئینعام فەرموو ، وە ئەمری بۆ نووسی بۆ والیی شام لە تەکالیفی حوکوومەت موستەسنا بێ .

غەرەز لەم حیکایەتە لە دنیا پیاوی‌وا بووەو پیاوی وەك مەجید ئەفەندیش بووە . ئەو شەوە بە هەر حاڵێ بوو پەنای عائیلەی نەقیبی دابوو ، وە بە تەهدیدو تەخویفی زۆر کە حوکوومەت پێ بزانێ منیش مەحو دەبمەوەو ئێوەش هەموو دەگیرێن ، ترسی زۆری نابوونەبەر . شەوی دوایی

ئەو نازدارانە ، ئەو خانمانە بە پیٚیان بە شەوی تاریك ڕیٚگای (کانی گۆمە) دەگرن ، هەتا دەچنە ئەویٚ لە سەد ڕۆح نەوەدونۆی لەترسا زایع ئەکەن .

حاسڵی خۆیان ئەگەیەننە شاخی (خاویٚ) . چەند شەو بە سەفالەت گوزەران ئەکەن ، عاقیبەت بە شارەزایی شیٚخ‌عەلی برای سەلمەخان ڕوودەکەنە شاربازیٚڕ ، بە هەزار فەلاکەت داخڵی بانە دەبن . لە بانە خەبەریان زانیبوو . شیٚخ‌قادر تەوەسسوتی بە مەحموودخان کردبوو . هەرچەند جوابیٚکی پیاوانەی دابوەوە ، بەتەواوی شیٚخ قادر دڵی ئەمین نەبووبوو ، ئیلتیجا بە ڕۆستەم‌خان ئەبا . لەویٚ زۆر بەحورمەت قوبووڵ ئەکریٚن . هەموویان چووبوونە ساوان . ئیٚمەش کە چووینە ساوان قەرەباڵغ زۆر بوو ، وە لە مەسرەفیٚ کە ڕۆستەم‌خان ئەیکرد مەحجووب مابووین ، وە دەیگوت هەرچی سەروەت‌و ماڵیٚکی کە خوا بە منی داوە بۆ ئیٚوەی خەرج‌ئەکەم . هیچ غائیلەتان نەبیٚ . لەپاش چەند ڕۆژیٚ شیٚخ‌قادر سواربوو ڕووی‌کردە موکریان بۆ خاتری فکری بەگزادەو ئەحواڵی ئەو سەفەحاتە شارەزا بیٚ .

ڕۆژیٚ دانیشتبووین تیٚفکرین میرزا ئەحمەدی برای کاکەحەمە پەیدابوو هاتەوە . نەقڵی‌کرد کە چوومەوە مەریوان وام‌زانی لەویٚ ماون . لە بالك میوان بووم ، ئولاٚغ‌و تفەنگیان لیٚ گرتم ، میوانداری‌یان کردم . لەناو خۆیانا ڕوانیم چریەچرپ پەیا بوو ، منیش نەمدەزانی چی‌یە . کە خەبەرم زانی[٦٩] ئیٚوە هاتوون بۆ بانە ، هەستام منیش سوار بم نە تفەنگ مابوو نە

---

(٦٩) ئەم وشەیە لە دەسنووسەکەدا نەنووسراوە . دیارە بەسەهو لەیادچووە .

ئولاّغ ، هەموویان لیّ شاردبوومەوەو تەماعیان تیّ کردم . هەرچەند رجامکرد فائیدەی نەبوو نەیاندامەوە . لە ئاخردا زەهیرکاری راست بیّ لە برازاکانی توورە بوو ، ناردی ئولاّغو تفەنگەکانیان بۆ هیّنایەوە . وە ئەحوالّی سەقزو پیاوەتیی شیّخ عارفی بەیانکرد . وە جەنابی سەییدی زەنبیل ئینتیزارە کورانی شیّخ بچنە زەنبیل . لەگەلّ کاکەحەمە قەراردرا کە ئیزن لە رۆستەمخان بخوازین ، برۆین . شەویّکیتر لە ساوان ماینەوە ، دزی پژدەری دوو ماینیان لیّ دزین ، ماینیّکی شیّخجەلال برازای شیّخو ماینیّکی شیّخ ئیبراهیم برای شیّخ . ئەوشەوە رۆستەمخان لە مالّ نەبوو . کە هاتەوە زۆر سەخلّەت بوو ، نۆبەچییەکانی فەلاقە کرد . بە هەموولاییّکدا پیاوی رەوانە کرد ، فائیدەی نەبوو . لە ئاخردا مەعلووم بوو کە لە (ئالان) لای کورانی وسمان ئاغایە . ئەم واقیعەیەش بوو بە سەبەبی زوو رۆیمان لە ساوان ، چونکە بەئاشکارا مەحموودخان عەداوەتی رۆستەمخانی ئەکرد ، وە شەریفوددەولّە شایعە بوو کە دیّت بۆ سەقز . غیاسوددەولّە تازە بووبوو بە حاکمی سەقز ، پیاوی ناردبوو بۆ لای مەحموودخانو رۆستەمخان مالیاتی داوا ئەکرد . خولاسە رۆیمان بۆ موکریان واجب بووبوو . ئیزنمان لە رۆستەمخان خواست کە حەزدەکەین بچینە (گویّزیّ) ئەویش عائید بە خۆتە . لەویّ ئیستیراحەت ئەکەین . بەوحیلەیە ئیزنمان وەرگرت ، بارمانکرد . سوارەی رۆستەمخان هەتا گویّزیّ روانەی کردین . شەو لە (نواویّ)دا [۷۰] زۆر خدمەتیان کردین . رەعیەتەکەی هەموو سمایلعوزیّری بوون لەویّدا ئیسکان بووبوون . بە چوونی ئیّمە گەلیّ خۆشحالّ بوون .

(۷۰) لە دەسنووسەکەی زیّوەر خۆیدا (ناداوی) نووسراوە . کاك موحەممەدی وەستا ئەورەحمان بۆی ساغکردمەوە کە ناوی دیّکە (نواویّ)یە .

بەیانی بە نی‌یەتی زەنبیل کەوتینەرێ . هەتا گەیشتینە باغاتی (تورجان) ئیستیراحەتمان نەکرد . من لەپێشەوە چووم بۆ لای ئاغای تورجان کە بەڵکو یەکێکمان بۆ شارەزایی لەگەڵ بنێرێ . چوومە ناودێ . سەیری ئاساری قەدیمەی تورجانم کردو تەماشای مەدرەسەی مەلای مەرحووم مەلاعەلیی قزڵجیم کرد ، مەدرەسە ئەنباری [٧١] کا بوو . بیست ماڵێکی ڕەش‌وڕووت لەو شارەدێیەدا هەبوو . ڕوومکردە قەڵا ، یەعنی قۆناغی ئاغا . چوومە ژوورێ ، تەماشامکرد ئەحمەدبەگ کە ئاغای ئەوێ بوو نووستبوو ، وە سەماوەرێکیش بە تاقی چاوە موهەییا کرابوو ، کەسی لێ نەبوو . قەدەرێ دیققەتم لە وەزعی بیناو ئەساسی کرد ، حەقیقەت مەقامێکی عالی‌و مەنزەرەیێکی خۆشی هەبوو . دەنگم نەکرد ، گەڕامەوە . لە پاییبی قەڵا کانی ئاوێکی ساردی لێ بوو چووم لەوێ ئاوم خواردەوە . دانیشتم هەتا کاروانمان هات . خەبەری نووستنی ئاغام دانێ . بە پرس‌کردن لەم‌و لەو کەوتینەرێ . نزدیك بە دێی (شیلانێ) بووینەوە دیققەتمانکرد چوار سوار شاخی گرتووە ، چواریش لە ڕێگاوە هات . چەند سوارێکی‌تر ئەترافی ڕێگایان گرتبوو خۆڤان لێ نیشت . سوارەکان ڕوویانکردە ئێمە ، چارنەبوو ئێمەش بۆ بەردەستیان دەچووین . لەپڕ یەکێ لە خۆمان خەبەری‌دا شێخ‌قادرە . وەك شکستەی ئیمداد پێ گەیشتوو ژیانیەوە . شێخ‌قادر بە غار هاتە پێشەوە ، ماندوونەبوونیان کرد ، موجمەلی ئەحواڵی موکریانی بەیانکرد ، وتی زەنبیل مەئمووری ئێرانی تێدایە ، بەئیحتیات بڕۆن . خۆشی دوعاخوازیی کردو گەڕایەوە بۆ بانە . ئێمەش ڕوومانکردە زەنبیل . لەپێشەوە پیاوێ چوو خەبەر بۆ سەیید ببا . خۆشمان لەخوار

---

(٧١) ئەنبار : عەمار .

زەنبیلەوە کانی گەڕاویٚ هەبوو ڕوومان تیٚ کرد ، نەچووینە ناودیٚ هەتا شەو تاریك دەبیٚ . ئەو دوو سیٚ ساعەتە هەتا ڕۆژمان لیٚ ئاوابوو هەزار مەرارەتمان دی . لە تینوا زوبانمان وشك بووبوو . ئەگەرچی دوو دەقیقە ڕیٚگا ئاومان لیٚ دووربوو نەماندەزانی لەو نزیکانە چەشمە[۷۲] هەیەو ، لەولاش جەنابی سەیید ، سەیید موحەممەدی کوڕی بە چەند سوارەوە بۆ ئیستیقبال ناردبوو . سەیید موحەممەد ڕاست ڕیٚگای تورجانی گرتبوو نەیزانیبوو لە کەناری زەنبیلین ، هەتا ساعەت یەکی شەو تەعقیبی کردبوو ، وە ئیٚمەش لە سەیید هەم مەئیووسیان پەیدا کرد کە قوبوولمان نەکا . لەپڕ خرمەی سوار پەیدابوو ، سەیید موحەممەد هات ، دەستبەجیٚ سوارەکانی دابەزاند ، باریان بۆ بارکردین ، مندالانی شیٚخی سوارکرد ، چووینە خانەقاە ، ئەوی لازیمەی میوانداری بوو بە ئەمری سەیید ئیجرا کراو بەخۆشی دامەزراین . لەپاش دوو سیٚ ڕۆژ ئیستیراحەت ئاغایانی (ئەسکی بەغدا) جەنابی حاجی موئمین خانو قۆچبەگ بۆ زیارەت هاتنە زەنبیل . کە چاویان بە من کەوت بە واسیتەی موعارەفەی پیٚشوو تەکلیفیان کرد کە من بچمە خدمەتی ئەوان . منیش ئیجابەتم کرد . کە تەشریفیان ڕۆیەوە ئولاغیان بۆ ناردم ، چوومە ناو ئەو بەگزادانە ، ئەو عالی هیممەتانە .

مەقسەدم لە نووسینی ئەم تەئریخە بچکۆلەیە بەیانی ئەحوالی عەشیرەتو میللەتی کوردە . بەومناسەبەوە واقیعاتی خۆشم نووسیوە .

لە ئیعتیباری تورجانەوە داخلی ولاتی موکریان بووین . موکریان ولاتیٚکی زۆرخۆشی بەواریداتە . عەشیرەتی (دیٚبوکری)و (بەگزادە) لە

(۷۲) چەشمە : کانی .

موکریانا ساکنن . هەر عەشیرەتێ ڕەئیسێکیان هەیە مولەققەب بە (ئێلخانی) . ئێلخانیی دێبوکری کوڕانی ئەو حاجی بایزئاغاو مەحموودئاغاو سەردار ئەسعەد عەلیئاغا ئیدارەی عەشیرەتەکە لەگەلێ داخیلو خاریج ئەکەن . موقتەزای تەبیعەتی کوردە هەر تایفەیەك لەگەلێ تایفەیەکی تر عەداوەتی هەیە[٧٣] . ئەم دێبوکرییە لەگەلێ بەگزادە ، مەنگوڕ ، گەورك ناخۆشییان دائیما هەیە . ئەمما بە واسیتەی حوسنی ئیدارەی کوڕانی حاجی ئێلخانی قیسمێ لە مەنگوڕو قیسمێ لە بەگزادەیان کردووە بە دۆستو ئەوکەسی کە دۆستیان بێ زۆر ڕیعایەتی دەکەنو بۆ موحافەزەی تێدەکۆشن . وەقتی شەڕ نەزدیکی هەزار سواریان دەبێ . زۆر تالیب بە عیلمو مەعریفەتن . قەدری عولەمایان لاهەیە . ئەگەر موعەللیمیان دەستبکەوێ بە تەرتیبی تازە بە منداڵیان دەخوێنن . بۆ حوکوومەت زۆر موتیعن . قەمچیی دەستی حووکومەتی سابلاغ ئاغایانی دێبوکرییە . قیسمی بەگزادە ئەوانیش زۆرن . ئەوی بەقودرەتە تایفەی فەیزوڵڵابەگیی پێ دەڵێن . ئەم تایفەیە مەحاڵی سەقزو بۆکان هەتا سابلاخو سەرحەددی گەورکیان ئیشغالێ کردووە . هەموو ساحێب قۆناغ ، ساحێب نان ، ساحێب سەیفو قەڵەم . (مع التأسف) ئەکسەری غەرقی سەفاهەتە ، غەیری عوشرەتو خواردنو نووستن فکرێکیکەیان نییە . لەگەلێ ئەوەش لە ئەحواڵی عالەم باخەبەرن ، وەك (طوائف الملوك) وانە ، کەس قسەی

(٧٣) هەرچەند زۆر جار بەدیمەن وا دێتە پێش چاو وابێ ، بەلأم ڕاستەکەی موقتەزای تەبیعەتی نە کوردو نە هیچ گەلێك نییە عەشیرەتەکانی دژی یەك بن ، ئەو دژایەتییەی لەناو هەندێ لە خێڵە کوردەکانو خێڵەکانی گەلانیترا هەیە «موقتەزای تەبیعەت»ی سیستێمی پاشکەوتووی دەرەبەگییەو ، بە بلاوبوونەوەی هوشیاریی نەتەوەیی ئەم «موقتەزای تەبیعەت»ە ئەبێ بە یادگاری مێژووی کۆن .

کەس ناخوێنێتەوە . ڕەئیسیان نوفووزی نی یە،ئەمما وەقتی شەڕ . . . [٧٤]
ئیتتیفاقیان هەیە . بۆ حوکوومەت ئەوەندە موتیعن بەو هەموو ئیقتیدارەوە
ساڵداتێکی [٧٥] ئێرانی ئەتوانێ هەموو ئەمرێ لەناویانا ئیجرا بکا .

قسە قسە ئەبرێ . والیی سنە شەریفوددەوڵە بە مەوجوودێکی سەد
کەسی یەوە هاتە سەقز ، نەیانتوانی لە موقابەلەیا حەرەکەتی مەزبووحانە
بکەن ، وە پازدە کەسی کورە کوڕەی لێ حەبس کردن ، بە پازدە هەزار
تومان جەریمە خۆیان نەجاتدا .

ئەو شەجاعەتی کە لە فەیزوڵڵابەگی جەدیان نەقڵ ئەکرێ ، زۆر لە
ئەولادانی دوورە ، وەلێ زۆر تەجەددودپەرستن ، عاشقی مەکتەبو
مەعاریفن . فکری قەومی یەت لە بەعزێکیانا مەوجوودە ، ئەویش لەبەر
ئیستیبدادو زوڵم لە ڕەعیەتو ئەهالیی بەردەستیان ئیزهاری ناکەن .
ڕەعیەتیان زۆر جاهیلەو عەوامن ، عەکسی کوردستانی جونووبی یە . لە
جونووبدا قیسمی عەوام فکریان نوورانی یەو خەواس جاهیلن . لە شیمال
خەواس خەواسە ، عەوام عەوامە .

لە تەئریخی کورد کە ئەڵمان نووسیویانەو بە تورکی تەرجەمە کراوە [٧٦] ،

---

(٧٤) لەم شوێنەدا وشەیەك کوژابووەوە ، بۆم نەخوێنرایەوە

(٧٥) ساڵدات : سەرباز . وشەیەکی ڕووسی یە ، کەوتووەتە ناو زمانی خەڵکی باکووری
کوردستانی ئێرانەوە .

(٧٦) ئەبێ مەبەستی زێوەر کتێبی (کوردلەر) بێ کە دوکتۆر فرێچ ناوی ئەڵمانی نووسیویەو
دائیرەی تەرجەمەو نەشری موهاجیرین لە دەوڵەتی عوسمانیدا کردوویە بە تورکی و
بلاوی کردوەتەوە . کتێبەکە ، کە سەرەتایەکی دوورو درێژیشی هەیە ، زیاتر لەدژی
کورد ، لەڕاستیدا پێداچوونەوەو لێکدانەوەی شەرەفنامەی بیدلیسی یە (لە مامۆستا
شوکور مستەفاوە) .

حوکوومەتێکی کورد لەژێر ئیدارەی (بۆداق‌بەگ) تەشکیل کراوە مەرکەزی موکریان بووە . قەڵەمرەوی ئەو حوکوومەتە مەراغە ، مياندواو ، ئورمیە ، ساباڵاخ ، سەقز ، بانە ، سنە ، سلێمانی ، کفری ، وە لە تەرەفی غەربەوە هەتا جەزیرە ڕۆیوە . لەپاش وەفاتی خۆی ئەولادی ئەو ئیختیلافیان تێ کەوتووە . هێندێ تەشەببوسی بە شای ئێران کردووەو هێندێ چوونە ئەستانبووڵ دەخالەتیان بە عوسمانی بردووە . گاه[77] ئەم غاڵب ، گاه ئەو . سیاسەتی دەولەتەین‌و نیفاقی بەینی ئەکراد بوو بە سەبەبی مەحوی ئەو حوکوومەتە . وڵاتیان بەش‌کرا .

لە موکریانا لە قیسمی بەگزادانا[78] عەزیزخانی سەردار زۆر بەئیقتیدارو جەوهەرو عەشیرەت دۆست ، ساحێب شیرو تیر ، قەڵەم‌و تەدبیر بوو . مەناقیب‌و مەحامیدی ئەو بەتەنها کتێبێکی دەوێ . لەپاش ئەو حسێن‌خانی سەردار کوڕی عەزیزخان بوو بە حاکمی ساباڵاخ . قەومی‌یەت‌و دیانەت لای ئەو عەیش‌و نۆش بوو . لەگەڵ ئەو هەموو ئەملاکە جەسیمە کە بووی‌و ئەو هەموو جەریمەو جەزای حوکوومەتەی کە ڕاجیع بە خۆی بوو ، دائیما سەدهەزار تومان قەرزدار بووە . نەتیجەی سەییئاتی ئەو باری قەرز بە ئیرس بۆ عەلی‌خانی کوڕی مایەوە . زابتێکی عوسمانی نەقڵی‌کرد وتی : «شەوێ چوومە مەجلیسی سەردار حسێن‌خان لە ساباڵاخا ، دانیشتم ، تەماشام کرد یەکێ دەستی خستبوە بناگوێی ئامان ئامان ئامان ئامان گۆرانیی دەوت . یەکێکی‌کە تاری لێ ئەداو ، چەند

---

(٧٧) گاه : جارێ .

(٧٨) لە دەسنووسەکەدا «بەگزادانە» نووسراوە .

ئاغایی[79] لە دێبوکری‌و فەیزوڵڵابەگی دانیشتبوون ، سفرەیەك لە بەردەستیانا ڕاخرابوو ، هەریەکە ، شووشەیی[80] قۆنیاغ‌و فڕووجێکی سوورکراوە بۆ مەزەو خۆشی ، لەلایێکەوە کەوتبوو ئاگای لە خۆی نەبوو ، وە چەند نۆکەرێ ڕاوەستابوون ، یەکی بازێ بەسەر دەستەوە . قەدەرێ سەیری ئەو وەزعیەتەم کرد . لەپاشا هەستام ڕۆیم» .

لەگەڵ عەزیزخانی باوکی نوقتەی موقابیل بوون . لە شەڕی ڕووس‌و عوسمانیدا بە توهمەتی جاسووسیی ڕووس گیراو حەبس‌کرا[81] . . .

---

(٧٩) لە دەسنووسەکەدا نووسراوە : «ئاغای» .

(٨٠) لە دەسنووسەکەدا تەنها «شووشە» نووسراوە ، بۆ مەعنابەخشینی ڕاستی ڕستەکە لام‌وابوو مەبەستی «شووشەیێ»یە .

(٨١) دەسنووسەکە لێرەدا ئەبڕێتەوە . گومانی تیا نی‌یە لێی فەوتاوە . ژمارەی لاپەڕەکانی (٦٠)ەو دوو فۆرمەیە . فورمەی یەکەمی (٣٢) لاپەڕەیە . جا ئەگەر دەفتەرەکەی لێی نووسراوەتەوە دوو فۆرمە بووبێ ، دیارە (٤) لاپەڕەی لەدواوە نەماوە . ئەگەر لە دوو فۆرمەش زیاتر بووبێ ، ئەوە دیارە زیاتری فەوتاوە .

# پێڕەس

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشەکی........................................ | ٣ |
| بەکورتی مێژووی ژیانی زێوەر........................... | ١١ |

* * * * * *

| گەنجینەی مەردان................................ | ١٣ |
| ئیسماعیل کوڕی ئەحمەدی سامانی ........................ | ١٧ |
| ئۆکتای قائان کوڕی چەنگیز خان........................ | ٢١ |
| خواجە نیزامولملك ئەبووعەلی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئیسحاق | ٤٤ |
| بوداق سوڵتان.................................. | ٥٢ |
| سوڵتان عەبدولحەمید خان ............................ | ٥٥ |
| قەومی کورد ................................... | ٦٢ |
| مەحموود پاشای جاف............................. | ٧٠ |
| نەقیب شێخ مستەفا .............................. | ٨٠ |
| ئیبراهیم ئاغای خوبیلە............................ | ٨٥ |
| شێخ مارفی قازانقایە ............................. | ٩٤ |
| نەقیب شێخ مەعرووف............................. | ٩٨ |

شێخ عەلی شێخ موحەممەد ، حیسامەددین ........................ ١٠٢
موحەممەد ئاغای کۆیە ........................................ ١٠٤
قادری سەعید ئەفەندی ........................................ ١٠٨
ئەمین زەکی بەگ ............................................. ١١٠
عەلی کەمال بەگ ............................................ ١١٣
میرزا تۆفیق قەزاز ............................................ ١١٩
شێخ عەلائەددینی بیارە ........................................ ١٢٥
شێخ مەحموود ............................................... ١٢٩
لە هەوالێر شێخ موحییددین ، لە کەرکووك سەیید ئەحمەد ............ ١٣٥
حەفسە خان کچی نەقیب شێخ مەعرووف ........................... ١٣٨
عەرەب ..................................................... ١٤١
پیرەمێرد .................................................... ١٤٥

* * * *

یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری ..................................... ١٥١
مەریوان ..................................................... ١٥٦
ئەحواڵی پۆلیتیکی مەریوان ...................................... ١٥٩
حەرەکەت .................................................... ١٦٠
موزاکەرەی مەریوانی‌و هەورامی .................................. ١٦٥
گەڵباخی .................................................... ١٦٦
لەشکری مەریوان بۆ سەر گەڵباخی ................................ ١٦٨
جەژنی ڕەمەزان .............................................. ١٧٢
خەبەری شێخ ................................................. ١٧٣
ئەحواڵی ئیقتیسادی ........................................... ١٧٨
جوغرافیای تەبیعی ............................................ ١٨٠

# سوپاس

* سوپاسی زۆری خاوەنی چاپخانەی ئەدیب کاك فەتحوڵلاّ عەزیزەو ، برادەری خۆشەویستم کاك حەمەکەریم فەتحوڵلاّ ئەکەم بەرانبەر بەو یارمەتی‌یەی یارمەتی‌یان دام بۆ بەچاپ‌گەیاندنی ئەم کتێبە .

* هەروا سوپاسی زۆری خوشکانی کرێکاری چاپخانە سەرپۆهی سەرکیس ، سێتا نەرسیس ، شیلان ئیبراهیم‌و ئاراکسي شاهێن ئەکەم بەرانبەر بەو ئەرکە زۆرەی کێشایان بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبە بەم شێوە قەشەنگە .

* سوپاسی بەدڵی هەموو ئەوانەش ئەکەم ئەو وێنانەیان دایەلام کە لەم کتێبەدا بلاّوم‌کردوونەتەوە ، بەتایبەتی ئامینەخانی خێزانی خوالیٚ‌خۆش‌بوو حەسەن فەهمی بەگی جاف‌و . شێخ ئەمینی نەقشبەندی‌و ، جەمال بابان‌و ، خالید ڕەسوولٚ‌و ، ئەوانەش چەند وێنەیەکیان لە ڕێگای کاك مەحموود زێوەرەوە داینیٚ .

* بیٚ‌گومان نابیٚ سوپاسی ئەو کاربەدەستە بەڕێزانەی ئەمینداریٚتیی گشتیی ڕۆشنبیری‌و لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمییش لەیادبکەم کە دەستێکیان بووە لە یارمەتی‌دانی بەچاپ‌گەیاندنی ئەم کتێبەدا .

**محمدی مەلا کەریم**